لە بابەتێکی نیگارکێشیدا کە ڕەنگە گۆزە یان گوڵدان یان قاپێک سێو بێت؟

چەند ماندووبوویت، خۆزگا پەنجەرەکەت بکردایەتەوە و سەرت ببردایە دەرەوە و هاوارت بکردایە؛ لە هەموو شتێک ماندووبوویت.. یان دەردە دڵی خۆتت بکردایە تا دڵت ڕەحەت دەبوو، خۆ هیچ نەبێ من گوێم لێ دەبوو.

بونیامانێکی بێ شوناس چ بابەتی نیگارکێشان، ژنانی بێ شایان چ بەژنبوون. ژنبوون خۆی لەخۆیدا شانازییە، دەبێت پیاو دروست بکەن، تا جلی پاسەوانییان لەبەر دەکرد یان شاپوایان دەکردە سەر و لەسەری کۆڵانەکاندا باج و سەرانەیان دەسەند، یان نا، دەبنە قەساب و مەڕێک دەکەن بەقولابی بەردەم دووکانەکەیاندا و چرایەک لەسەر دوگەکەی دادەگیرسێنن. چاویان بەملاو لادا دەگێڕن لە ژێر عەبای ئەم ژنەوە بۆ سنگی ئەو ژن، یان دەیانتوانی خەنەبگرنە ریشیان و بەڕەمل و ئوصتورلاب(*) و قاپ و کاسە و ئاو و ئێسقانەوە، لە گۆشەیەکدا دادەنیشتن نوشتە نووسی بکەن، کتێبی دوعاکەیان لەسەر بەرماڵێکی یەزدانی بکەنەوە و تاڵعی گەڕاوەکان ببینن. چ گاڵتەجاڕییەکە بونیام لە بەخترەشی ئەوانی ترەوە نان بخوات و هیچیشی لەدەست نەیەت بۆیان،

(*) ئوصتورلاب: ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا یۆنانییە و بەمانای تەرازووی ئەستێرەکان دێت، بەو ئامێرە دەوترێت کە لە سەدەکانی پێشوو و سەرەتای فەلەکناسیدا بۆ پێوانی دووری هەسارەکان و دیاریکردنی دەمی سپێدە و خۆرئاوابوون و دەیان کاری تری ئەستێرەناسی بەکار دەهات، دواتر بە هاوکاری هەندێک کەرەستەی تر جادووگەر و نوشتەنووسەکان بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان بەکاریان دەهێنا. و

نا ئەوان نەیاندەتوانی کەسی تر بن جگە لەوەی کە هەن، مرۆڤگەلێکی بێ نرخ کە بۆ هەر هاوجێگەییەک تاوانێکیان لەدەست دێت.

وەک ئەوەی عەشقت لەگەڵ مردوویەکدا کردبێت، یان تاوانێکت کردبێت، سزایەکی سەختی دەدایتەوە، دیلی بوویت، دڵت خەریکبوو پەڕی دەردەکرد بۆی، هەر کە بیرت دەکەوتەوە، مەرگیت ئارەزوو دەکرد.

وتت " چ سەرپۆشێکی ناسکە.. جوان بووی"

"جوان؟ مەگەر جوان نیم؟ گێلە پیاو نازانیت قسە بکەیت"

"من خۆ هیچم نەوتووە.. ویستم بڵێم....."

"زۆر باشە.. کە نازانی قسە بکەیت، دەمت مەکەرەوە.. بڵێ منداڵتر دیاری.."

"داوای لێبووردن دەکەم"

"بۆ ئینسان شتی قۆڕ دەڵێت و دوایی داوای لێبووردن دەکات؟"

"حەوسەڵەتم نییە.. هەستە برۆ دەرەوە"

"تۆ برۆرە دەرەوە، من حەوسەڵتم نییە.. ئێستا میوانم دێت، شوێن نییە دەمەوێت بیهێنمە ئێرە"

"مەبەستت پیاوی ترە؟"

"ئا.. لەسەری مەڕۆ"

دەستیت گرت بەزۆر هەڵیسێنیت و بیکەیتە دەرەوە، بەڵام بێ سوود بوو، سەیرێکی کردیت و ئەوەندە جوێن و قسەی ناخۆشی پێ وتی کە بەرتدا.

وتت "تۆ چیت لە گیانی من دەوێت؟"

"هیچ"

"کەواتە برۆ"

"شوێنم نییە"

"بچۆ بۆ گۆڕستانێکی تر.. چوزانم.. برۆ بۆ جەهەنەم"

"کەس وەک تۆ میهرەبان نییە، بۆ هەرکوێ دەڕۆم، دڵم مەیلی تۆ دەکات، ڕێ دەگرم و دێمەوە لای تۆ، بەڵام هیچ کاتێک خۆشم نەویستوویت، ئەمەم بەڕاستییە و بیر دەکەمەوە کە ....."

"بەڵام من خۆشم دەوێیت"

"دەبمهێنە.. بەڵێن دەدەم هەرچی بڵێی بەگوێت دەکەم، قاچەکانت لە تەشتێک ئاوی گەرم دەنێم و مەساژییان دەکەم.. دەتشۆرم و وشکت دەکەمەوە، چێشتت بۆ لێ دەنێم.. دەبم بەمۆدێل کە هەرچۆنێک حەز دەکەیت وێنەم بکێشی، تەنانەت ئامادەم بەیانی هەتا ئێواریٚ وەک پەیکەرێک لە بەردەمتدا بکەومە سەرچۆک، بەس لەم دەربەدەرییە رزگارم بکە، ماندووبووم ئەوەندە لە باوەشی پیاوی جۆراوجۆردا کێنگڵم دا، هەریەکەیان بۆنێکیان هەیە، هەریەکەیان ئەخلاقێکی سەیری هەیە، بەڵام تۆ میهرەبانی، لە هەموویان جیاوازی. حەز دەکەم مێردم هەبێت، منداڵم ببێت، ئەوجا مەمکم لە دەمی بنێم و بەدەستەکانم هێواش هێواش نەوازشی بکەم تا دەنوێت و پاشان بێم بۆ لای تۆ"

بەپەنجە میهرەبانەکانی بناگوێی تۆی نەوازش دەکرد، سەرتی دەخستە سەر ڕانی و هێندە ناوچەوان و ژێر چاوتی نەوازش دەکرد، کە بیرت چووەوە چرچی کەوتووەتە ناوچەوان و ژێر چاو و دەوری لێوانت.. لاجانگ و چەند تاڵێک لە سمێڵت سپی بووبوو ئیتر کارت تەواو.. هەموو

ڕۆژێک بڕی تلیاک و مەشروبەکەی خۆت زیاد دەکەیت، ئەو کۆپیکارییەی کە دەیکەیت هەر بەشی تلیاک و مەشروبەکەت دەکات. هێور هێور دەچیتە خەو و کاتێک چاوت کردەوە شەو بوو من ڕۆیشتبووم، لەسەر ڕانی ئەو نوستبوویت و سەیری چاوە ڕەشە بریقەدارەکانیت دەکرد منت لە بیر چووبووەوە؟

نا ... من چووبوومە سواری شەمەندەفەر، سەرم بە جامەکەیەوە نوساندبوو لە زوڵمەتی بێ کۆتاییم دەڕوانی، چەمەدانییەک بەلای سەرمەوە بوو کە دڵمی دەگوشی.. پیاوێک؛ کاتێک کە من خۆمم تەسلیم کردبوو، ئەو دارونەداری خۆی دۆڕاندبوو، بەڵام ئایا ئەمە قومار بوو؟ ئایا ئەو قومارچیی بوو؟ وە من براوەی ئەم یارییە بووم؟ بونیامێکی بەختڕەش کە تەرمی پارچە پارچەکراوی مەعشوقەکەی لە چەمەدانیی نابێت و بێ ئەوەی کە خۆی بیەوێت یان بزانێت، بۆ شوێنێکی نادیاری دەبرد، ئەمەش تەنیا لەبەرئەوەی کە شەهامەتی خۆکوشتنی نەبوو، خۆی دابووە دەست ئەم حاڵە. تۆ ئەمە ناو دەنێی ژیان؟ کە هەریەکە لە ئێمە تەرمی کەسێکمان ناوە بەشانمانەوە و بە شەمەنەفەرێک بەرەو شوێنێکی نادیار دەڕۆین کە نە سەرەتای دەزانین و نە کۆتایی...؟ دڵمان بەوە خۆشە کە زیندووین.

چەند پەرییەک کە لە بەرچاومدا ئازادانە سەما دەکەن بێ خەیاڵم و وا هەست دەکەم کە هەر نایان بینم، چەند بەلای شتهایەکی گرینگدا تێ دەپەڕم و وا دەزانم هەر هیچ نەبووە، چەند لە تیشکە ئاڵتوونییەکانی خۆر نیگا دەکەم کەچی وا بیر دەکەمەوە کە خۆر هەرگیز تیشکی ئاڵتوونی پەخش نەکردووە. چەند بە بوون بێ باکم، ئێمە توانای دیاریکردنمان نییە، نازانین هەڵبژێرین.. نا ئێمە هەڵنابژێرین، ئێمە

هەڵبژێراوین، هەڵبژێراوین کە تەرمی ئازیزێک بنێین بە شانمانەوە و لە پرسەیدا ئارەق و فرمێسک بڕێژین، ئەگەرنا بۆ کاتێک پەنام بۆ ماڵی ئەو بردوو لە بەرامبەریدا، لە حزوریدا لەسەر چرپاکەی راکشام، دیواری سەنگین و سیای خەو نەیدەهێشت ئەو ببینم؟ بۆ کاتێک لە باوەشمدا بوو جەستەی لەرزیوی بەگەڕانێکی منداڵانە، بە گەڕانێکی سۆزاوی دایکانەی من، خۆی لە مندا گرمۆڵە دەکردوو دەیویست بۆ رەحمی من، بۆ سکی من؛ شوێنێک کە لێوەی هاتبوو بگەڕێتەوە. دڵی لە لێدان وەستا؟ ئایا ئەو منداڵی من بوو؟ ئایا دەیویست لە خوێنی رەحمی مندا دابمرکێتەوە و لە پەنای ئارامی مندا خۆی لە سەختی و زبری رۆژگار بشارێتەوە؟

هەموو دڵتەنگی و مەیلەکانی من بۆ ئەو تازە بوو، وەکو دایکێک کە هەنگوینی خوێنی خۆی بە کۆرپەلەکەی بدات، وەکو مەرگ کە بە هەموو توانایەوە دەچێتە وێزەی ئینسان و فاتیحانە هەموو کلاورۆژنەکانی ئومێد دادەخات، وەکو عەشقەی مەرگ لە منەوە ئالابوو. رەنگە لەبەرئەوە بووبێ کە لەدەست سەختی و زبری ژیان خۆی بشارێتەوە، نازانم.

تەنیا ئەوە دەزانم کە ئەو نیازە ئەزەلی و ئەبەدییە هەمووانی جادوو کردبوو، ئەو خۆشی جادوو کرابوو، چ رەنجێکی دەکێشا! دوو مانگ و چوار رۆژ بێ منی، بەمنەوە گوزەراندبوو. لە هیجرانێکی شادی هێنەر و ویساڵێکی خەمئەنگێزدا، لە تەنیایی خۆیدا، لەگەڵ ئازیزێک کە من بووم، گاهێ بووم و گاهێ نەبووم.

تۆش ئاشق بووبوویت و من باش دەمزانی، خۆت دەتویست کە ئەمە وا نیشان نەدەیت، بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو، هەموو گەردیلەی وجودت ئەوی بانگ دەکرد، هەمیشە شتێکت لێ کەم بوو، خەیاڵت دەکرد

کە دەبێ بڕی تلیاک و مەشروبەکەت زیاد بکەیت، چ بێ سوود بوو، هەرچەند زیاتر ئەم ئەفیونە دەچووە گیانتەوە ئەوەندەش نەشئەی کەیف هێنەر، لۆچی زەحمەتی لە سیاما و دەرونتا زیاتر نمایش دەکرد.

لە دوڕیانێکدا تیا مابوویت، نەدەتتوانی بەرگەی بگری، نە عەشقیشیت بیر دەچووەوە. تێکەڵەیەک بوو لە عەشق و نەفرەت، هەرچی لە تۆدا هەبوو وەک بەرق و با هەڵهاتبوو، بەڵام دڵیشتی لەگەڵ خۆی بردبوو، ونکردویەکت هەبوو، ئەوت چنگ نەدەخست. ئەوکاتەی کە دەتدۆزییەوە پەشیمان و گۆڵ خواردوو لە جووڵەی کیسەڵ ئاسای خۆرت دەڕوانی و رۆژ ئاوا نەدەبوو، شەوان چاوت لەسەر مانگ بوو، کە لەودیو پەنجەرەوە لە شوێنی خۆی نەدەجما بەیان بدات. هەر رێیەک دەڕۆیشتی بەو کۆتایی دەهات، لەگەڵ ئەوەی کە بەبیرت بێ ئەگەر بەدرێژایی ژیانت سووکایەتییەکت بیستبێ، لەوت بیستووە، ئەگەر گریابێتیت هەڵبەت هەر ئەو گریانویتی، ئەگەر ساڵهایەک کۆپیکاریت کردبێت و نەتتوانیبێت کارێکی هونەری دروست بکەیت، رەنگە لەبەرئەوە بووبێت؛ کە روخساری مەعشوق لەلات تەجەللا نەبوو، هەرچیت دەکرد نەتدەتوانی تابلۆیەکی بکێشی.

ئازاری هەبوو، ئارامی نەبوو، لە رێوە کە دەگەیی وەکو کاغەزێکی سپی گرمۆڵەی دەکردیت و پاشان دەڕۆشت، هێندە لە گێلێتی خۆت بەردەوام بوویت کە ناچار بوویت ئەو بکوژیت، بەڵکو خۆتی لێ پاک بکەیتەوە، سەرئەنجام بەو کۆتاییە گەیشتیت کە پارچە پارچەی بکەیت و لە دەستی رزگارت ببێ. بەڵام تێگەیشتیت لە راستیدا زنجیری گەردنت توندتر کردووەتەوە. کە سەریت لێ کردەوە، برۆ تێکەڵاوەکانی و چاوە کراوەکانی دەیانخواست هەلێکی تریان بدەیتێ، بە لێوانێک کە لە

نێوان گریان و پێکەنیندا تیامابوو وەک بڵێی دەیویست قسە بکات، یان بە گوناهەکانی خۆی پێ بکەنێت، وەک ئەوەی خۆشی لەو ژیانە بێ مانایەی خۆی ماندوو بووبێت، بەمەرگ پێ دەکەنی، بەلام لە ترس و ئازاردا بەهەناسەبڕکێوە دەلالایەوە و هەموو چەکە ژنانەکانی خۆی خستبووە کار تا پێش بەم کوشتنە بگرێت.

تۆ ئیتر نەتدەبینی، تەنیا دەنگی سووکایەتی پێکردنیت دەبیست، لە دڵتا وتت "لەبەرئەوەی خۆشم دەوێیت، دەتکوژم" بەلام سەیر دوچاری دوودڵییەکی فەلسەفی بوویت، کە دەبوو رستەکەی خۆتی تێدا راست بکەیتەوە کە؛ "نا.. لەبەر ئەوە دەتکوژم، خۆشم دەوێیت" ئیتر جیاوازی چی بوو؟ رێی ئاشتی نەکرابووەوە تا دەست لە کوشتنی ئەو هەڵگریت، رۆژی سەد جار هیوای دەخواست کە بریا تۆ بمردیتایە و ئەو بەئاسانی بتوانێ میوانەکانی بەرێتە ئەوێ.

لە دڵی خۆتا وتت "بیرتە؟" کێردی تیژی چێشتخانەکەت بەگوشاری زیاتر لەسەر دەمار و پێستی ژێر ملیت دانا و خوێن فیچقەی کرد و پەڕییە سەر شووشەی چاویلکەکەت، دیسانەوە بەردەوام بوویتەوە لە کارەکەت، ئەوەندە کێردەکەت هێنا و برد تا سەریت لە لاشەی جیا کردەوە و خوێن فوارەی کرد، دەموچاوە شینەکەی سپی هەڵگەڕاو دەتووت دەگەڕێتەوە بۆ خەونی پاکی منالی.. سیمای ئارام بووبووەوە و کە فەڵەی ناوچاوانی و گۆناکانی نیشتنەوە.

ئاه .. لەودیو ئەم دەموچاوە ترسناکەوە وێنەی فریشتەیەک بوو تا ئەوکاتەی نەتزانی بوو؟ چەند جوان بوو، ئایا دەبوو دووبارە زیندووی بکەیتەوە؟ بۆ ساتێک هەرچی نەفرەتت بەرامبەری هەبوو، وەک با رۆیی، بریا کار بەمە نەگەیشتایە، بریا ئەوت دروست بکردایەتەوە، ئایا درۆیە

که دەتوانرێ مرۆڤ بە ڕەهەندی مرۆڤی شارستانی نزیک بکرێتەوە؟ ئایا ڕاستە کە کاتێک ئادەم مرد، ڕەزالەتەکانی شەیتان بردی و روحیشی خوا؟ باری تەعالا.. هیچ ناخۆشییەک لە ڕوخساری فریشتە ئاسای ئەودا نەدەبینرا، ڕەگەکانی ناوچاوانی کە بەهەر لێدانێک دەبەنگی و گەمژەییان دووبارە دەکردەوە، ئێستا ئیتر ئارام بووبوون، قژی پێچ پێچی ڕەشی لە چەرچەف و خوێندا مانایەکی تازەیان دەدا، چاو بریقەدارەکانی بە بنمیچەکەوە هەڵواسیبوو بێ ئەوەی کە مۆڕە بکەن یا پزیسکێکیان لێوەبێت، لێوەکانی .. ئەو لێوە گۆشتنە نیوەکراوانەی کە دەتگوت تازە لە ماچێکی گەرم و درێژ هەڵگیراوە و هێشتا تێر نەبووە، وەک خۆیان مابوونەوە، نوشتایتەوە و لێوەکانت نایە سەر لێوەکانی، بۆ یەکەم جار سەرمای تەزوو هێنەری ئەو گۆشتە نەرمە خستیتیە لەرزە. نەتزانی چەند چرکە یان چەند سەعات بەسەر لێوەکانی ئەوەوە مایتەوە و هەستت بە سەرمایەکی سەیر دەکرد، کە لەرزێکی وای لێ هێنابوویت، کە هیچ پێوەندی بە سەرمای ئەم تەرمە سەهۆڵ کردووەوە نەبوو. بۆ ساتێک پێڵوی چاوی چەپی لەرەیەکی کردوو وەستایەوە. سەیری دەستەکانیت کرد کە چنگی کردبوو بە سەرچەفەکەدا، هەردووکیانت لە ئەنیشکەوە لێ کردەوە و دات بە دیوارەکەدا، نینۆکە تیژەکانی دیوارەکەیان رووشاند و وەستان. پەنجە شادەی دەستی ڕاستی بەتەواوی نوشتابووە و پەنجەی ناوەڕاستی دەستی چەپی کە ئەنگوستیلەیەکی خاچی تێدا بوو ڕێک و درێژ مابوو، قاچەکانیشت لێک جیا کردەوە، چەند جوان بوو دەتوت پەنجە گەورەی لە خەجاڵەتییەوە بووە بە ئاو، سەری کەمێک چەماندبووەوە. رانە گەورەکانی کە پێچرابوون لە سەرچەفە سپییەکەوە برِیت و جیات

کردەوە. نیوەی لاشە بێ سەرەکەت کە وەک پەیکەرێکی بەردین دڵۆپی خوێن لە دەمارەکانییەوە دەڕژا، لە تابلۆیەکی تردا نیگار کرد. قەڵەمەکەت دانا، جگەرەیەکت پێ کرد، پێنج تابلۆشت خستبووە لاوە و بۆ تەماشای جەستەی پارچە پارچەیان دانیشتی. ئایا بەڕاست شێوەیەکی وەهای هەبوو یان تۆ بەم شێوەیە ئەوت کێشابوو؟ ئایا لەو کاتەدا منت بیر کەوتەوە؟ ئیرەیی نابەم، بەڵام ئایا مانای جوانیت زانی؟

مژێکی قوڵت لە جگەرەکەت دا و هەستت کرد هێزێک تۆ بۆ لای هەزارپیشەکە راکێشا، چەکمەجەکانت یەک لە دوای یەک راکێشا، شتەکانی ناویانت ئەمدیواودیو کرد تا سەرەنجام ئەوەی دەتویست دۆزیتەوە، قەڵەمدانێک بوو کە بەرگی نیگارێکی نهێنی ئامێزی لەسەر بوو؛ لە بیابانێکی بێ کۆتاییدا پیرەمێردێکی قەمبوور لە ژێر درەختێکی سەروودا دانیشتبوو، کچێکی جوانیش لە بەردەمیدا چەمیبووە و بەدەستی راست گوڵێکی نیلۆفەری شینی پێشکێش دەکرد. بە پێکەنینێنە مەدهۆشانە و بێ ئرادەکەی کە بەسوچێکی لێویەوە وەک پەڵەیەکی گەورەیی خوێن وشک بووبوو، بە لێوە خونچە ئاسا نیوە کراوەکانییەوە، بەقژی رەش و ئاڵۆزاوی هەمان شێوەوە کە لەسەر سەری تۆپەڵی بەستبوو، بڕۆی پێوەست، چاوی رەش، کە لە هەر کەسێکی بڕوانیبایە مەگەر خوا بیزانیایە چی بەسەر دەهات. هەموو ئەوانە نیشانەی کچێکی ساسانی بوو کە دەیگوت لە دەستی پێپەتییەکان هەڵهاتووە و بۆ پەردەی تابلۆ پەنای بردووە تا لە ئەماندا بمێنێ. ئەو دوو قومرییە هەراسان و بچووکەی سینەشی ئامادەی هەڵهاتن بوون بێئەوەی باڵێکیان هەبێت بۆ فڕین، پۆلێ شمشێر بەدەست بەشوێن ئەودا لە کۆڵانە چۆڵەکانی نیوەڕۆدا، سمیڵ بابڕ،

راوشکارانە بەچاوی کونپشکیانەوە دەتگوت عەرد کون دەکەن و ئاسمان دەجەڕێنن.

ئەی بۆ کوێ چوو؟ هیچ کەس لەو کۆڵانە نەبوو، دیوار و بانیژەکان لەو سوورەی هەتاوەدا بە هێواشی رەنگەکانیان ئارام ئارام بۆ سوور دەگۆڕا، دەنگگەلێکی دووری تر و خەڵکی شار بەگوێ دەگەیی، بەڵام کەس دیارنەبوو. دەنگێک وتی "منالّی بەرگدروو، ئەستێرەکانی ئاسمان چەندن؟"

"تاڵەکانی ئەسپی من چەندن؟"

"منالّی بەرگدروو، ناوەڕاستی زەمین کوێیە؟"

کەس وەڵامی نەدایەوە، تەنیا دەنگی داکوتینی مێخ بەزەویدا دەهاتە گوێ، ئەو پێپەتییە شپرزانە عارەقیان دەڕشت و تینو بە دوای کچێکدا کە ئاسان خۆی نەدەدا بەدەستەوە کەوتبونەڕێ و نەفرەتیان لەو رۆژگاری گەڕان و سۆراخە دەکرد، بێ ئەوەی زمانی کەس بزانن..

ئەی تف! ئەگەر ئەم زمانە وشکە ئاوی دەبوو مەگەر دڵی بێڕەحم درێخی دەکرد؟

سەیرێکی پەنجەرەکەت کرد، دنیا تاریک بووبوو، چەند سەعاتێک، یان رەنگە چەند ساڵێک تێپەڕی بێت. ئایا ئەوە گرینگ نەبوو؟ گرینگ نەبوو مێژوو چەندە پیاوانی وا تینوی بەخۆیەوە بینیوە؛ ئادەمانێک کە لەسەر ئەم عەرزە گەرمە لێویان وەک لێوی ماسی دەیوت ئاو، لە تینیۆتیدا وەختەبوو بێن بەلادا و ئاوی دەریاکانیش سوێر، جۆگە ئاوێکیان دەویست کە لە کەناریدا گوڵی نیلۆفەر رووابێت.

پیاڵەت پڕ لە مەشروب و کرد و هەڵت دا. ئایا حەزت نەکرد کەسێک

ئۆکـۆردیۆن بژەنـێ و بەئاوازێکی خـەمگین بچـریکێنێ «ئەی رۆژگـاری نەخش و نیگاران، ئەی دڵی خـەوتوو، ئەی خـەوی شـیـرین..» ئەوی تری چی بوو؟ بیرم نەماوە، لە زەینمدا وتم " دێیت پێکەوە قسە بکەین؟"

سـەرت بەرز کـردەوە من نەبووم، رۆیشـتـبـووم و دەنگی شـەمـەنەفـەر دووردوور هاتە گوێ، هەرچەندە دوورتر دەکەوتمەوە زیاتر یادی تۆ دڵمی تەنگ دەکرد و هەناسەمی قەپات، وەکو ئەشکێک کە هەرگیز نەتوانم لە چاوانمەوە بۆت برێژم، لە گـۆشـەی زینـمـدا بـووی و دڵۆپەت کـرد. وەکـو بوغزێک کە لە قورگمدا مابووەوە، ئاوا مایتەوە.. ئەی رۆژگاری نەخش و نیگاران!

پیاوە نابیناکەی تەنیشت دەرگەی قاوەخانەی فیردەوسییت لە بیرە؟ پاڵی دەدا بە دیوارەکـەوە و ئۆکـۆردیۆنی دەژەنی، جـارجـار کـەسـێک ئەسکەناسێکی دەخستە گیرفانییەوە. قیافەیت بیر دێتەوە؟ شێوەی لە کـەس نەدەچوو لە خـۆی نەبێ، چاویلکەیەکی رەشی لە چاو دەکرد کـە سەری لووتی بەزەحمەت لە ژێرییەوە دەبینرا، شێوەیەکی بازاڕی هەبوو، غـەبغـەدار، سـەری مـاش و برنجی، قـژی لوول و شـانە کـراو، پاک و خـاوێن، کاتێک کە لێوە سوورەکەی دەجوڵا ئیتر بونیام تێ دەگەیی کە دەیەوێت بچـریکێنێ «ئەی رۆژگـاری نەخش و نیگاران» چاکـەت و پانتـۆڵەکـەی هەمـیـشـە رەساسی بوو، قۆپچـەکـانی داخـراو، ویقـاری پیـاوێکی هـەبوو کـە سـەرەتا مـن ترسـام ئەگـەر پارەیەک بخـەمـە گیرفانییەوە، دەست لە ئۆکۆردیۆنەکەی هەڵگرێ و چاویلکەکەی داکەنێ و بەشێوەیەک سەیرم بکات کە یانی، کارێکی باشت نەکرد.

"ببورە بەڕێز.. چەند جوان دەیژەنیت، کاتێک کە تۆی لێ نەبێت ئێمە شـتێکمـان ون کـردووە، دەنگ و سەدای ئـەم شەقامە بێ تۆ هەر قسـەی

قـۆڕە، دەزانیت؟ من زۆر سـوپاسی تۆ دەکـەم.. یانی هەمـوومـان" بۆ نەمدەتوانی قسە بکەم و لە کاتی سەرکەوتن بە قادرمەکاندا هەڵدەنوتام، هەمیـشـە بەمـجـۆرە کـاتێک بونیـام لەسـەر خـۆی نـەبێت هەڵدەنوتێ، جانتاکەی لێ دەکەوێت و هەرچی تێدایە هەڵدەڕێژێت. چ مەرگم بوو کە وا دەترسـام دووبارە ئەم ئاهەنگە بوەسـتـێنێ، بەرەو ڕووم بێت، پەلم بگرێ و جانتاکەم بداتەوە دەست و تاسـەر و قادرمـەکانەوەم بگەیەنێ و بپرسێ "خۆ هیچت لێ نەهاتووە؟"

بۆ وا سـەیرم لێ بەسـەرهـاتبـوو، زۆر بێ تاقـەت بووم بـۆی، بەدەنم ئازاری دەهات، ئێسـقـانەکـانم لە گـشت لایەکـەوە هاواریان دەکرد و ئەژنۆم دەلـەرزی، کـە چوومـە قـاوەخـانەکـە دیسـانەوە ئەو لـەوێ نەبوو. قـورسـایی دنیـا کـەوتە سـەرشـانم و ڕێـی هەناسـەمی قـەپات کـرد، بۆ ساتێک لەو ناوەڕاستەدا سەرگەردان بووم، نـەمزانی بۆ لەوێ وەستاوم، بۆچی هاتووم و چیم دەوێت و چ مەرگم بوو؟

چوومە شـوێنە هەمیشـەییەکەی خۆم و لای پەنجەرەکەوە دانیشـتم، بـەڵام هیـچم بانگ نەکـرد، جگەرەیەکم پێ کـرد و دڵم سـپـارد بـە ئۆکـوردیۆنـەکـە. جـێگەی من لە کـۆتاییی قـاوەخـانەکـەدا لە شـوێنێکی لاپەنادا بوو، پاڵم دەدایە و بە دیوارەوە و هـەموو قاوەخانەکەم دەخستە ژێر چاوەوە. بەڵام ئێـسـتـا نەمـدەویست سـەیری هـیچ شـتـێک بکەم، دەمویست گوێ لەو مۆسیقایە بگرم و لە خۆم بپرسم کە ئایا ئەویش بیر لە من دەکاتەوە؟ ئەسڵـەن منی لە یادە؟ چەند جارێک سـەلامم لێ کرد، کڵاوەکەی بەرز دەکردەوە و دەنوشتایەوە و بەڕێزەوە زەردەیەکی دەگرت، ئایا لەگەڵ هەموو کەسێکدا هەروابوو یان تەنیا بۆ من ڕێزی دەنواند؟ تۆ لە بیرتە چاوی دەبڕییە من و بەدەستی چەپ یان ڕاست یاری بە سمێڵی

دەکـرد، بێ خـەیاڵ و رەحـەت منی دەخـستـە ژێر ئەو نیگایانەی و دەیتـواندمـەوە، خـۆشی بە زەردەخـەنەیەکی نـهێنی ئامـێزەوە بۆ پەروەردگاری من درودی دەنارد.

گارسۆنێک کە کراسێکی سەوزی لەبەردابوو لە منی پرسی کە هیچم دەوێت، من گـوتم نا، دواتر سێ پیـاو هاتنە سـەر مـێزەکـەم، دووانیـان مەست بوو، یەکێکیان قژبژێک بوو.

"دەبێت زۆر ببوریت.. هاا.. هەڵبەت جەنابت شاعیریت"

مژێکی خـەستم لە جگەرەکەم دابوو، دووکەڵەکەی لە قورگما پەنگی خواردەوە، سـەیرم دەکرد، لاواز و درێژ و بێ جورم، کاکۆڵی هێنابوویە سـەرچاوی، دوکـەڵەکـەم کـرد بـە سـەروچاویدا و هـەنگاوێک بۆ دواوە لەترێکی دا، بەڵام نەیدەتوانی هاوسـەنگی خـۆی رابگرێت، بەمـلاولادا دەکـەوت. عارەقیـان لە شـوێنی تر دەخـواردەوە و دەهاتنە قـاوەخـانەی "فیردەوسی" یان قاوەخانەی "نادری" قاوەیەکیشی بکەن بەسەردا.

قژ بژەکەیان کورسییەکی راکێشا و لەسەری دانیشت، ددانەکانی دەسـتکرد بـوون و کـاتێک بەچاوە شـینەکـانی تێی دەڕوانیم، هەسـتم دەکرد سـەیری دوو هەڵماتی شووشـە دەکەم، وتی "زۆر حەز دەکەم گوێم لە شیعرەکانی تۆ بێت" روو بەهەرسێکیان وتم "من ئەهلی شیعر نیم.. ئەهلی نیگاری سەربەرگی قەڵەمدانم"

"نەمگوت جەماعەت؟ من دەمزانی ئەمە پێوەندی بەمیرزا قەڵەمدانەوە هەیە"

"ژن چۆن جگەرە دەکێشێت"

"من دەیکێشـم"و ناوچەوانم دابەیەکدا، سێیەمیان لووتێکی قـەوس و

قژێکی لووسی هەبوو، مژی هەڕەمەکی لە جگەرەکەی دەدا و وادەهاتە پێش چاو لە دووانەکەی تریان حەرامزادەتر بێت، بەدەست ئاماژەی بۆ کورسیە خاڵییەکەی ئەو کرد و وتی"من حەزم لەو پیشانە نییە کە کۆتاییەکەیان "کێش" بێت"

وتم "مەبەستت؟"

"ویستم بپرسم لەو جەنابی نیگارکێشە هیچ هەڵدەکرێ؟"

نەمتوانی بەربەخۆم بگرم، بەری دەستم کێشا بە مێزەکەدا و هەستام" هیچ پێوەندییەکی بە تۆوە نییە"

"بۆ دەیکەیت بەهەرا؟"

"دەمانەوێت بزانیت تامی چۆن بوو؟"

"هەر ئەوەندە" هەرسێکیان پێکەنین.

بۆنی شیرینی دێت.

دەمویست بەجانتاکەم وەها بکێشم بەدەموچاوی ئەو سەرسەریەیانەدا، کە پەرچەمی بنوسێنم بەناوچەوانییەوە، دەمویست بڵێم قوڕ بەسەرتان. لەبەر ئەمەیە کە ئێمە بەم حاڵەوە شانازی نەتەوایەتیمان نییە؛ هەستی هەرەوەزیتان نییە، مرۆڤەکان بەمرۆڤ نابین، لەبری کار بەتاڵە لێ دەدەن و لە بەیانییەوە تا ئێواری چەنە دەدەن.

ڕەجاڵی خەسیوانە، ناپیاوانە، ئەگەر راست دەکەن بۆ جێیەک نییە داکۆکی لە مافەکانتان بکات؟ بۆ چوار کەستان ناتوانێت پێکەوە هەڵبکات؟ بۆ هەرکەسێک دێت یەکسەر بەئاسانی دەچێتە مێشکتانەوە، قوڕ بەسەرتان، کەچی تەنیا وتم "ڕەجاڵەکان، بێدەنگ" قیژاندم و بە

هەردوو دەست گوێیەکانم گرت تا دەنگی خۆم نەبیستم، گرِم گرتبوو، بۆ چرکەیەک هەستم کرد یەکێک لەوان لە دواوە زنجیرەکەی کردمەوە کراسە رەشەکەم کەوتە خوارەوە و من رووتبوومەوە.

نەمزانی چەند زەمەن تێپەڕی، تەنیا بیرمە کە دەستەکانم لەسەر یەک لە رووی مەمکەکانم دانابوو، رووت لە بەرامبەر ئەو هەموو شمشێر بەدەستە وەستابووم، قاقایان لێ دەداو من ئەم جارەم ڕێی دەربازبوونم نەبوو کۆمەڵێک لە مێشکما دەستیان بۆم رادەوەشاند، دەموچاویان دیار نەبوو.

وەکو باڵۆنێک سووک بووم و لە بێکێشی زەمەندا ڕۆدەچووم، وەکو بڵێیت دنیا وەک میزەڵانێک وابێت و چووبێتە مەکۆ، من لە کاتێکدا چنگم بەپەتێکی ئاشکراوە کردبوو تێکەڵاو لە رەنگەکانی سوور و سپی جێ دەمام، بۆڕەی مانگا دەهات، زایەڵەی دەنگی کارمەندانی پزیشکی دادوەری، دەنگی کەسانێکی تێکەڵوپێکەڵ کە من هیچیانم نەدەبینی، دەنگی زەنگی تەلەفۆنێک لە سالانی دواتردا؛ گوشییەکەم هەڵگرت و گوتم "فەرموو"

"سلاو"

"سلاو لە تۆش"

"ببورە چەند ساڵیت؟"

پێش ئەوەی وەلامی بدەمەوە پرسی کە ناوم چییە؟ حەوسەڵەم نەبوو وتم "کوێت لێ داوە؟" یەک ژمارەی بەهەڵە وت، گوشییەکەم دانایەوە. دووبارە زەنگ لێ درایەوە، گوشییەکەم هەڵگرت و گوتم "فەرموو"

وتی "چ دەنگێک!"

وتم "ئیشت بەکێ هەیە؟"

وتی "ببوورە ئێرە کوێیە؟"

وتم "پزیشکی دادوەری"

گوشییەکەی دانایەوە، ئەو شڵەژا و من بەئارامییەکی تەواوەوە بیرم لە رابردوو دەکردەوە و بۆ قاوەخانەی فیردەوسی گەڕامەوە. قاقای پیرەمێردێکی قەمبوور دەهات و ئەوان لە دەورم کۆ بووبوونەوە، لە ناو ئەو ژاوەژاوە غەریبەدا تەنیا ژنەفتم کەسێک ووتی "تۆش چوویتە ریزی مردووانەوە" بوغزم کردبوو لێوەکانم دەلەرزی و سەرم داخست، بەڵکو گوڵی نیلۆفەر بچنم و پێشکێشی پیرەمێردی قەمبووری بکەم، بەڵام کە سەرم بەرز کردەوە ئەو سێ پیاوە رۆیشتبوون، پیاوێکی تر لە بەردەممدا راوەستابوو کە چەندین جار بینیبووم، لەگەڵ ئەو شاعیرە بالابەرزەدا دەهات و ئازاری بە مێروولە نەدەگەیاند. چاوەکانی ریپۆقی کردبوو شتهایەکی لە ڕەفتاری ئەو شاعیرە بالابەرزەی تێدابوو، ئەوەی کە قۆڵی هەڵدەکردوو ئارەقاوی و لەرزیو، بەچاوەکانی لێم دەپاڕایەوە کە سرنج رۆبکەمە رەگە هەڵماوساوەکانییەوە. بە گریانەوە وتم "من ئەهلی شیعر نیم.. ئەهلی نیگاری سەر بەرگی قەڵەمدانم" چاکەتەکەی خۆی داکەند و دای بەمندا، دانیشتم سەیرێکی دەوروبەرم کرد، تا بزانم کێ سەیری کردووم، دواتر ئەو پیاوە وتی کە خەریکی کاری خۆیانن، هیچ نەبووە.. چی بووە؟ لێکهەڵە تێگەیشتنێک بوو تەواو.. ئەرێ.. هەر ئەوەی کە وتم، هەڵە لێ تێگەیشتنێکی بچووک.

کراسەکەم لەبەرکردەوە و ئەو پیاوە زنجیرەکەی بۆ داخستمەوە، چاکەتەکەی لە شانم لێ کردەوە بانگی قاوەی کرد، وتم "بریا مەشروبم بخواردایە" گارسۆنەکە بۆ من قاوەی هێنا، پیاوەکە لە گیرفانی

جانتاکەیدا شووشەیەکی دەرهێنا و فنجانەکەمی لێ پڕکرد، وتی "تا ئێستا عارەقت بە قاوەوە خواردووەتەوە؟" من وتم "نا" ئەوەی لە فنجانەکەدا بوو فرِم کرد، سیگارێکم پێ کرد، پشتی دەستم دەگەست و دەمویست قسە بکەم، لێ گریان فرسەتی نەدەدا، وتی "بە بڕوای من وا قورس مەیگرە، بەو شێوەیە نییە کە ئێوە دەفەرموون، ئەسڵەن مەفەرموون" دەستی کرد بە گیرفانی بەرباخەڵیدا، پۆستەرێکی دەرهێنا و نیشانی دام، فۆتۆی ئەو شاعیرە بالآبەرزەی پێوە چەسکرا بوو، لەسەری نووسرابوو «انا لله و انا اليه راجعون»، وتی "بە بڕوای من دنیا قیمەتی ئەم پەیڤانەی نییە" پۆستەرەکەی چوار قەد کردوو لە گیرفانی نایەوە، وتی "توبی خوا مەگری، من شاعیرم، حەساسم زۆر، ناتوانم بتبینم کە تۆ ئەشک بڕێژیت" وتی "حەیف نییە تۆ ئەم قسانە دەکەیت.. نا.. وا مەفەرموو" وتی "بە بڕوای من جەستەت وەک بلوورە، جوانیشی هەزار ماشاڵڵا.. بەلای کەمەوە رەحمێک بەمن بکە"

نەمتوانی قسە بکەم، فرمێسکەکانم سڕی و فنجانە خاڵییەکەم بەگارسۆنەکە نیشان دا تا دانەیەکیکە بهێنیت، بەڵام دڵم شتێکی تری دەویست، شتێک کە من لەم حاڵەتە دابڕێ و لە گوڵ و گوڵزاردا نوقمم بکات، تفت و سوێرییەک لە دەمارەکانمدا بگەڕێ و من بۆ دنیای پووچی ببات، نزیکی مەرگ، تا بەردەرگەی دەسشوییەکەی قاوەخانەی فیردەوسی، بەڵام قفڵی دەرگەکە سووربوو، وەستام تا کەسێک کە لەوێبوو بێتە دەرەوە، روانیمە باخچەی پشت قاوەخانەکە، پشیلەیەک لە ژێر سێبەری دارقۆخێکدا بەچکەکانی دەلێسایەوە، لەولاتر منداڵێک لەسەر سندوقێک دانیشتبوو سەوزەی پاک دەکرد، هەموو ئێسقانەکانم هاواریان دەکرد و دەمارم خێراخێرا لێی دەدا، چەند تەقەیەکم لە

دەرگەکە دا، پیرەمێردێکی پاک و تەمیز لە کاتێکا دەستەکانی بەدەسماڵێکی سپی پاکدەکردەوە، هاتە دەرەوە و من چوومە ژوورێ، بەڵام ئیتر دەرگەکەم قفڵ نەکرد، لە بەردەم ئاوێنەکەدا وەستام، سرنجم پڕکردوو چەقاندمە دەمارم. سووتانێکی بەورووژان لەسەر رووی پێستم نیشت.

بۆنی شیرینیی سووتاو دەهات.. وێنەی ئاوێنەکە کە من بوو تاریک داهات، ژنێک لە ناوەڕاستی نێگاری سەر کەمۆڵەی نێرگەلەیەکی بلووریی گەورەدا، لەسەر کورسییەکی دارین دانیشتبوو، لە کاتێکدا پیاوەکان مژیان لە نێرگەلەکەدەدا، بڵقی ئاو بەسەر لەشییەوە دەخزاو دەچوو بۆ ئاسمان، چاوم تروکاند و دووبارە سەیرم کردەوە، ژنی نیوەڕووتی ناو تابلۆکە سەمای دەکرد و پیاوە مەستەکان شانیان دابووە سەر پشتییەکانیان، دەستێک بە جامی بادە و دەستێک لەسەر ورگیان مەدهۆش و خەواڵو جارجار لێیان دەڕوانی، یەکێک رەبابی دەژەنی یەکێک دەفی لێ دەدا، ئەو ژنەی کە سەمای دەکرد نەخۆش بوو، حاڵەتێکی باشی نەبوو، ئایا لە ئازاردا وا خۆی دەپێچا یان بەراستی دەیویست سەما بکات؟

سرنجی خاڵیم لە دەمارم دەرکێشایە دەرەوە، جێ سووتانێک تێمدا بەسرپییەکە و لەسەر پێستمەوە نیشت، وێنەی ئاوێنەکە تاریک نەبوو، من چرچە نادیارەکانی پێستی دەموچاوم بەئاسانی دەدی، ئایا ئەو ژنە من بووم یان کەسێکی تر؟ ژنێک بەچاوێکی کز، شانێکی داکەوتوو و کوڕەوە، دەستەیەک مووی سپی سەری لە هەردوو لای لەچکەکەیەوە هاتبووە دەرەوە، دەستێک بەئەژنۆ و دەستەکەی تری بە کەمەریەوە، لە ناو چ کەسێک هاتبوو کە داوێنی سوڵتان بگرێت و فیغان بکات؟

هاواری دەکرد، کە هەرچی دەیکێشم لەدەست تۆ دەیکێشم.

بەلوعەکەم کردەوە و دەموچاوم شۆرد لە ئاوێنەم روانی. خۆم ناسی، خـەندەیەکم بۆ خـۆم کـرد، قـاچاکـانم هێـواش دا بەزەویدا تـا بزانم مـەحکەمن، ئەوکاتە دەنگی ون و دووری ئۆکوردیۆنم بیست و تێگەیشتم دنیا زۆر گەرمە، بەقادرمەکاندا چوومە سەرەوە و خۆم گەیاندە مێزەکەم ئەو پیاوە هێشتا جگەرەکەی تەواو نەکردبوو، دانیشتم و جگەرەیەکم ئاگردا.

وتی "خۆتان ساز کرد؟"

سەرم بادا، بەڵام نەک بەنیشانەی بەڵێ، پاشان وتم "بەڵێ؟"

"پرسیم باشتری؟"

بە زۆرەکی زەردەخەنەیەکم کردوو بابەتەکەم گۆڕی"بەڵێ.. دەموچاوم شۆرد، کەمێک فێنک بوومەوە"

"ئێستا نا.. کاتی خۆی، دەبێت منیش بڕۆم دەموچاوێک بشۆم"

چ پێوەندی بە منەوە هەیە، ئەسڵـەن تاقـەتم لێی نەبوو، جگەرەکەم بەنیوەی خامۆش کرد و وتم "چەند گەرمە"

«بەبڕوای من، دەبێ بڕوای تۆش بپرسم، مەیلت لێیە بچینە ماڵی من، زۆر دوورنییە لە شەقامی "سیروس"ە.»

"سیروس؟ هەمان ئەو شوێنەی کە دوێنێ پیاوێک خۆی و چوار منداڵ و ژنەکەی بەبەنزین سووتاند؟ شارەزام.. یانی تا ئێستا نەڕۆیشتووم، وەلێ بیستم کە پیاوێک خۆی و خێزانەکەی ئاگر تێ بەرداوە"

فنجانە قاوەکەم بەرەورووی درێژ کرد تا کەمێکی بڕێژێ، دیسانەوە لە جانتاکەیدا شووشەکەی دەرهێنایەوە و فنجانەکەی لێ پڕکرد و وتی کە

لەگەڵ قاوەدا حەشر دەکات، وتی "ئەمە کۆنیاکە، بەبڕوای من کۆنیاک و قاوە پێکەوە یانی تۆپ" فنجانی قاوەکەم یەکبینە هەڵدا و گەرم بوومەوە.

وتی "بەڕێکەوت وابوو بەڵێ، لەسەری کۆڵانەکەی ئێمە بوو، دەزانێ دوێنێ عەسر کە ...." هەستام "زۆر سوپاسی لوتفت دەکەم من لەوە زیاتر زەحمەتتان ناخەمەبەر"

بە سەرسوڕمانەوە سەیرێکی کرد "بۆ کوێ؟"

"درەنگمە"

عاجز و خەمبار دەهاتە پێش چاو، وەک ئەوەی لە مەجلیسێکی خەتمدا، خواردنیان دابێتە هەموویان و ئەمیان فەرامۆش کردبێت، وتی "ئاخر دەزانی من شیعرێکم لەوەسفی تۆدا هۆنیوەتەوە، کە زۆر حەزم دەکرد بیخوێنمەوە و سەرنجتانی لەبارەوە بزانم، بەبڕوای من زۆر زوو دەتەوێت بڕۆیت"

وتم "ئەگەر بەپێویستی دەزانیت شیعرەکەت بخوێنیتەوە، باشە بیخوێنەرەوە" پەشۆکاوانە بەدوای شیعرەکەدا گەڕا، لەم گیرفانەوە بۆ ئەوگیرفان، لە گیرفانی بەر باخەڵەوە بۆ گیرفانی لاتەنیشت، گیرفانی دواوە، سەرەنجام دۆزییەوە، کاغەزێکی چوار قەدکراوی کردەوە و بە مژێکی قوڵی لە جگەرەکەیەوە خوێندییەوە:

"دەنک دەنکی هەنار

تۆبوویت کە لە زارمەوە دەرژایت

کەوچک کەوچک ئێمە سوور و تەڕتر دەکەیتەوە

تۆبووی بە نیگا

ئێمەت ......"

وتم "داوای لێبوردن دەکەم"

بە پەشۆکاوییەوە وتی "هێشتا تەواو نەبووە"

"بەڵێ، دەزانم" بۆ دوایەمین جار چاوم بە دیوارەکان و جێگە خاڵییەکەی ئەودا گێڕا و جانتاکەم هەڵگرت، لە شوێنی خۆی هەستا و بەری لێ گرتم، ئێستا هەستم بەکراسە رەشەکەی و ریشە نەتاشراوەکەی کرد، وتی "بەڕاست هەواڵت هەیە کە هاورێکەی ئێمە مرد؟"

"مرد؟ کام هاورێی ئێوە؟"

بەدەست ئاماژەی بۆ گیرفانی بەر باخەڵی کرد "ئەوەی کە.... چۆن بڵێم، بیرتان نییە؟ پۆستەرەکەی بەدار و دیوارەوە هەیە"

بیرم بوو، ویستم بپرسم بۆ مرد، بەڵام وتم " هیچم بیرنایەت"

"بەهەرحاڵ، گەزازی گرت و مرد"

"خۆتان خۆش بن"

"بونیامێکی گوڵ بوو.. گوڵ.. هەمیشە خەیاڵی دەکرد لە چلساڵیدا دەمرێ و هەرواش بوو، مرۆڤێکی زۆر باش بوو، بەڵام قسە نەدەچوو بەگوێیدا، دەچووە بەردەم دۆلابی پشت ساردکەرەوە بەرزەکان و لەوێ تەزریقی دەکرد، نامەردەکان سرنجی پیسیان لێ دابوو، بێ خوێنبازی.." یەکسەر برووسکەیەک بە پشتمدا هات، وەک ئەوەی منیان لە ئاگردا دەرهێنابێت و لە سەهۆڵیان هەڵکێشابێتم، گوتم "خوا لێی خۆشبێت، من ئیتر دەبێت بڕۆم"

وتی "دەتەوێت لەگەڵتا بێم؟"

"نەخێر" خێرا لەوێ هاتمە دەرەوە و ئەسکە ناسکێکم خستە گیرفانی

ئەو موسیقارە نابینایەوە، خۆم گەیاندە شەقامەکە، حەزم دەکرد بەنێو خەڵکەدا وەک وەرەقەی یاری بەجۆرێک هەڵبگەڕێمەوە کە کەس هەست نەکات چیم. عەسرێکی گەرم بوو، قژم سەر شانەکانمی قورستر دەکرد، پیاوێک لە قەراخ شۆستەی جادەیەک چیچکەی کردبوو، بە سەتڵێکی حەلەبی سوور شۆستەی بەردەم دووکانەکەی ئاوەڕشێن دەکرد. من زۆر گەرمامبوو، حەزم دەکرد جلەکانم دابکەنم و خۆم بخەمە بەر ئەو ئاوە، حەزم دەکرد سەرم لەو ئاوەدا نقوم بکەم و تاسەد بژمێرم، کە چی تا چلیش نەمدەتوانی، ئەگەر زۆریشیان لێ کردمایە.

ماشێنێکی پانوپۆڕی رەش هۆڕنی لێ دا و من گوێم پێ نەدا، پیاوێک بەلامدا تێپەڕی و لە ژێر لێوەوە وتی "بووخۆم" من هەروەک ئەوەی نەشمبیستبێت، بەڵام خەریک بوو سەرسام دەبووم. ئەم هەموو دوژمنەم هەیەو نەمزانیوە؟ لە دنیایەکدا دەژیم کە هیچ پەنایەکم نییە، دنیایەک کە هیچ وێکچوونێکی لەگەڵ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی نییە، جێگەیەک وەک بێشە و دڕندە و من ناچار بووم بەرگەی بگرم و بەترس و لەرزەوە بەڕێدا بڕۆم، بەترسەوە بنوم و بەپەشێوییەوە رابم، مەگەر چەندێک دەژیام تا نیوە زیاتری تەمەنم لە پووچەڵکردنەوەی پلانی ئەوانی تردا بەفیڕۆ بدەم، بۆ کەس بەفریادم نەدەهات؟

بۆ ساتێک سەرم گێژی خوارد، بیرمکردەوە، لە کوێ بووم و بۆ کوێ دەڕۆم و لە کام زەماندا وەستاوم؟ نەمدەزانی بەردەوامبم لە رۆیشتن یان بگەڕێمەوە؟ بۆ کوێ بگەڕێمەوە؟ بۆ شەمەندەفەرێک کە لەتاریکیدا بەخێراییەکی سەرسوڕهێنەر دەڕۆی؟ بۆ قاوەخانەی فیردەوسی؟ یان بۆ ماڵی ئێوە؟ تاسەتم دەکرد، گرێی سەرپۆشی خەیاڵم توند کردەوە و بۆ ماڵی ئێوە رێگەم گۆڕی، بەڵام لەپڕ ژنێک لە بەردەممدا هەڵتۆقی و

بەئاوازێکی تووڕە وتی خـوشکێ.. وتم من نیم.. پەشـیـمـان بوومــەوەو بەهەمان رێدا کەوتمەوە رێ، گەرمام بوو حەزم دەکرد بیر لەوە بکەمەوە، سێ مـانگ نا دوو مـانگ و چوار رۆژ بوو کـە ئەوم نەدیبـوو هـیچ کـەس و هیچ شتێک جێی خاڵیی ئەوی پڕ نەدەکردەوە، تەنانەت رۆژگاری نەخش و نیگارانیش. مـاوەیەک بوو نەدەهاتە قـاوەخـانەی فـیـردەوس کـەس هەواڵێکی لێـینەبوو، هیـچ شـتـێک بۆنی ئەوی لێ نەدەهات، ئایا لە من رەنجا بوو؟ قسـەی لێ دابڕیبووم؟ ئایا ئیـتر تاقـەتی نـەمابوو، وا خۆی نیشان نەدەدا؟

من ســالانێک بەر لە هاتنم بۆ ئەم دنـیـایە، خـۆمم لەودا هەست پێ دەکرد، لە روحی ئەودا، لە خوێنی ئەودا بووم، بەدەمارەکانیدا دەڕۆیشتم و لە نیگایدا هـەردەم نیـشـانەیەک لە من بوونـی هەبوو، کـاتێک دەهـاتە خـەونی تۆوە بەڕوونی دەمدی کە دەستی دەکاتە گەردنتانەوە بۆ خـالقی من دروود دەنێرێ. سـەیری تابلۆکانـی تۆ دەکات و بەگـاڵتـەوە دەیگوت ئاغای کۆپی دەولە، ئایا هەنوکە لە یادتدا بووم؟ حەزم دەکرد یەک جار، تەنیـا جـارێک ئەو ببـینم و ســلاوی لێ بکـەم، لە بەردەمـیـدا بـەڕێزەوە بوەسـتم کـە کـلاوەکـەی لە سـەری دابگرێت و بڵـێت هەوا چەند بۆگـەن بووە، یا بۆ نموونە تۆ نـاوت چییە و چەند ساڵیت، تەنانەت حـەزم دەکرد بە تووڕەییـیـەوە بڵێ "بۆ دێیتـە ئەم قـاوەخانەیە، لـە کونجێکی مـاڵەکـەتدا داکەوە وا هـاتوو سەرێکم دا " تا من بڵـێم " ئەم شەو دێیت؟" دەیتوانی لە شتێکی تـر تووڕە ببێت و لە خولقەتی من گلەیی بکات و بەگرژییەوە بڵێ "بۆچی هـاتویتـە ئەم دنیـایەوە؟" من بڵـێم "بۆ سـەرلێتێکدانی تۆ" پاشـتـر ببم بـەدووکـەڵ و لە بـەرامـبـەر ئەو چاوڕەش و بریقـەدارانـەیدا هەڵبـێم. ئارەزووم بوو یـەک جـار، تەنیـا یەک جـار، چاوەکـانی بدرەوشـێـتـەوە و

زەردەخەنە لە روخساریدا نەخش ببەستێ و بەمن بڵێت "یاهو.... دیدارت بە قیامەت"

بۆ بەدبەختبووم، بۆ هەرگیز پێی نەدەگەیشتم و ئەگەر بشگەیشتبام وەکو مێشهەنگ لە روحی مندا پورەی دەدا و لە چاوتروکانێکدا تەرکی خانەو لانەی دەدا؟ ئایا لەبەرئەوەی چوارپارچە ئێسقانی ئەم جەستە بێ خوێن و روحەی بدات بەسەرمدا؟ چەند بەدبەختبووم و نەمدەزانی.. چەند سەرم کرد بەیانە و قاوەخانەکاندا، چەند لە بەرامبەر ماڵیانەوە رۆیشتم بەڵکو ئەمەخوایە شوێنەوارێکی ئەو ببینم و نەمبینێ، چەند شەو بەیادی ئەو نوستم و کە چی تۆ هاتیتە خەونم، ئایا تۆ ئاستەتەنگی نێوان دیداری من و ئەو بویت؟

ئیتر نەمدەزانی.

گەرمام بوو، بە شەقامێکدا سوڕامەوە، کە پڕدرەخت بوو سێبەرێکی زۆرتری هەبوو، لە خێراوێک ئاوم خواردەوە، خۆم بەدوکانی وێنەکێشەکانەوە و خڵەفاند. ئەوێ گوزەری قەڵەمدانییەکان بوو، هەموو نیگارەکانیان لەبەر خۆرەکەدا دانابوو تا وشک ببنەوە، یان رەنگە بۆ تەماشاکردنیش دایان نابێت، تابلۆکان هەریەکەیان چیرۆکێکیان هەبوو؛ دوو کۆتر لەسەر ستارەیەک هەڵنیشتبوون و بە ماتییەکەوە بیریان لە درەختەکانی ئەولای تەلارێک دەکردەوە، ژنێکی باڵابەرز گۆزەیەکی پڕی لەسەر شان نابوو، درەختێک پڕبوو لە قەلەڕەش، هەڵۆیەک بە ئاسماندا دەسوڕایەوە، درەختێکی تر ئەوەندە گەورە بووبوو کە لە چوارچێوەی تابلۆکە چووبووە دەرەوە. چوومە پێشتر هەندێک لە تابلۆکان مرۆڤیان بۆ لای خۆیان رادەکێشا، هەندێکیان تەنیا ئیشی ئاوی بێمانا بوون، چەند ماسیگرێک عارەقیان دەردابوو تۆڕیان رادەکێشا، ژنێک منداڵێکی

له باوەش گرتبوو، پشیلەیەک خەریکبوو بەگلۆڵە شلیلەیەک یاری دەکرد، له تابلۆیەکی تردا پیاوێکی مووبۆر سەیری من، یان کەسێکی له پشت منەوەی دەکرد، ئاوڕم دایەوە کەس له دوامەوە نەبوو، دووباره سەیرم کردەوە، وتم من؟ بزەیەکی کرد، دەستێکی بەمووه بۆرەکانیدا هێنا و به دەستەسڕێکی سپی عارەقی ناوچەوان و سەرلێوی سڕی، سەعاتەکەی بەرەو رووی من گرت و دەستی نایه ژێر چەنەیی و وەک خۆی وەستایەوە. چومه پێشتر سەیری سەعاتەکەیم کرد، بەڵام نەمتوانی بزانم سەعات چەندە. منیش بزەیەکم بۆ سەندەوە و سەرێکم بۆ لەقاند، یانی کە چی بووه؟! چاوی تروکاند، لێوی جوڵانەوە بێ حەوسەلانه وتی"پزیشک بووم هەر له خۆت و خوڕای نەخۆشکەوتم و مردم، هەربەو ئاسانییە، زۆر قوڕیاته.. کەس تەکلیفی ئەمە نازانێت، تۆ ئەمە ناو دەنێیت ژیان؟"

دەستی چەپم بەحاڵەتی پرسیار بردەپێشێ، وەکو گوڵ کردمەوە، جارێکی تر سەرم راوەشاند یانی کە هیچ ناکرێت و بەتەنیا له چوارچێوەکەیدا جێم هێشت و رۆیشتم.

ئەسپەهایەک بێ ئەوەی حیله بکەن هەڵیان دەخستەوە، له تابلۆیەکی تردا تیزه جارێک هەم پێ دەکەنی و هەم دەگریا، لەپڕ چاوم کەوت به پەردەیەک کە بەدیواری بەرامبەر دووکانێکدا هەڵواسرابوو، پەردەیەک که له ناویدا کانیاوێک ورده شەپۆلی دەدا و نەسیمێکی فێنک دەهات، پەلوپۆی شۆڕەبییەک لەسەر تاشەبەردێکی بەرزەوه سێبەری رژاندبوو بەو ناوەدا و هیچ کەسێکی لێ نەبوو، تەنیا خاوەنی دووکانەکه نەبێت که له پشتی ئەو تابلۆیەوه دانیشتبوو تەرمیمی تابلۆیەکی تری دەکرد، که وێنەی گوڵدانێک بوو.

چوومە دووکانەکەوە، ساتێک سەیری ئەو پەردەیەم کرد، چەند ئاشنا بوو، من ئەم دیمەنەم لە کوێ بینیبوو؟ بیرم لەوە دەکردەوە جلەکانم دابکەنم و خۆم لە ئاوەکە هەڵکێشم، گەرمام بوو، حەزم کرد بگەڕێمەوە، جانتاکەم لەلایەکەوە دانا و کراسەکەم داکەند و بێ ئەوەی دەنگم لێوە بێت چومە ئاوەکەوە. ئاوەکە سارد بوو هەرجارێ کە دەچوومە ناوی شتێک دەڕژایە دڵم.

خاوەن دووکانەکە هەروا کە تابلۆیەکی تەرمیم دەکرد، لەپڕ ئاوڕی دایەوە، فڵچەکەی فڕێ دا و سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد، من خێرا خۆم کرد بەژێر ئاوەکەدا و کاتێک سەرم دەرهێنا، بینیم کە خەڵکی لە بەردەم دووکانەکەدا کۆبونەتەوە و بەسەرسوڕمانەوە سەیرم دەکەن، دووبارە خۆم کردەوە بەژێر ئاوەکەدا و ئەمجارە کە سەرم دەرهێنا ئەو پیاوە ئیشەکەی وازلێهێنابوو، رووەو ئەو لایە سەرگەردان وەستابوو، گرینگیم پێ نەدا، سەیری تاشەبەردەکەم کرد بەڵکو پەیکەری فەرهادی لەسەر ببینم، بەڵام کەس لەوێ نەبوو، نەمزانی بۆ ئەوەندە چاوەڕێ بووم تا بەڵکە کەسێک لەسەر ئەو تاشەبەردەوە سەیرم بکات.

بیستبووم هەرکاتێک لەسەر کانی و ئاوێک بم کەسێک لە شوێنێکەوە سەیرم دەکات، کەچی هەرچەند لەملا و لام دەڕوانی کەسم نەدەبینی، دڵم پەلەپەل لێی دەدا و شتێک لە ناخمەوە دەڕژا، ژێرە مەلەیەکم لێ دا، بەدەستی کراوە بەسەر رووی ئاوەکەدا و زەردەخەنەیەکی وەنەشەیی کە وابزانم لەبەر ساردی ئاوەکە یا رەنگە لەبەر نەبینینی پەیکەری فەرهاد بووبێت، بەقژی رەشی خوساو، چاوی چاوەڕوانییەوە هاتمە دەرەوە.

چەند حەزم دەکرد سالانێک لە چاوەڕوانیدا بمێنمەوە، تا بەڵکو کەسێک لەسەر ئەو تاشەبەردەوە سەیرم بکات، یان بزانم ئەو پەیکەرەی

روحی خۆی داوه بەو بەردە لە کوێیە؟ پەیکەرێک کە ڕۆژانێک منداڵی بەرگدرووبوو بۆ داخوازی کچی پاشا دەچوو.

لەپڕ خاوەنی دووکانەکە ئاوڕی دایەوە و بینیمی، وەک ئەوەی سەیری درەختێکی گڕگرتوو بکات، یان وەک ئەوەی کە دڵی ئیتر توانای لێدانی نەمابێت، دەستی تا سەر سنگی هێنا و ناڵەیەکی بچووکی کرد.

وتم "مەترسە"و پێکەنیم

وتی "تۆ لێرە چی دەکەی؟"

وتم "گەرمام بوو" سەرم گێژی دەخوارد و دڵم توند لێی دەدا، وتی "حاڵتان باش نییە"و بەرەو ڕووم هات کە لەسەر زەوییەکە هەڵم سێنێتەوە، وتم هیچ نییە، خۆم دەتوانم، دانیشتم و عارەقی ناوچەوانم بەلەپی دەستم سڕی و وتم "ئاو" بەدەستی لەرزۆکی پەرداخێک ئاوی دامێ و من یەکبینە چۆڕبڕم کرد، کە پەرداخەکەم لە سوچێکی دووکانەکە دانایەوە ئیمزای تۆم لە خوارووی تابلۆکەوە بینی، خێرا هەستام، جلەکانم تەکاند و بەزەردەخەنەیەک ماڵئاواییم لە پیاوەکە کرد.

ڕوخسارێکی تکاکارانەی هەبوو، هەستم کرد ئامادەیە گیانی خۆی بەخت بکات و لەوێ گلم بداتەوە، بیری خاوەن ماڵەکەمانم کەوتەوە، بەو جیاوازییەی کە ئەمیان دوچاری سەرسوڕمان بووبوو، چاوێکی لە من کردوو چاوێک لە تابلۆکە و سەرئەنجام خۆی نەگرت و وتی "چ لێکچوونێک" چەند هەنگاوێکی ناو بەدەورمدا سوڕایەوە، وتی "تۆ لە کوێوە هاتوویت؟"

من بێدەنگ بووم و خۆش خۆش پێ دەکەنیم، وتی"خەریکیت بۆ کوێ بچیت؟ دیسانەوە قسەم نەکرد و خۆم بە تابلۆکانی ترەوە خەریک کرد،

وتی "تۆ ناوت شیرین نییە؟" چاوێکم بەسەرتاپایدا گێڕا هیچی بەفەرهاد نەدەکرد، هێواش جانتاکەم هەڵگرت و لە دووکانەکەی هاتمە دەرەوە.

لە ژێر سێبەری درەختەکانی شەقامەکەدا راستەڕێم گرت و بێ سەرنج لە دەوروبەر خێرا دەڕۆیشتم، بریا بمتوانیبا لەو تابلۆیەدا بمامایەتەوە و تۆم لەوێ ببینیبا، گوڵی نیلۆفەرم لەو کەنارە بچنیبا و پێشکێشم کردیتایە. خۆزگە لەبەر خاتری لێکچوون لەگەڵ جەماعەتدا خۆت کۆم دەکردەوە بەشێوەیەک لە دوورەوە وا بهاتیتایە پێش چاو کە تۆش پیرەمێردێکی قەمبووریت، جۆگە بەلای پێتا رەوانە و درەختی سەرووش سێبەری بۆ تۆ کردووە، کە هەر کەسێک بیبینێت بڵێت لە ژێر سێبەری سەرووەکەدا، ئەگینا خۆ هەتاوێک لە گۆڕێ نەبوو، تۆش بەدڵنیاییەوە سەرقاڵی پاککردنەوەی فڵچەکانت بوویت.

"ئەم هەموو تابلۆیە بۆ تۆ بەس نییە؟ کەواتە تۆ لە کوێیت؟"

خەمگین نییە؟ تۆ بەدوای مندا بگەڕێیت و من بەدوای تۆ؟ کحول بە دەمارەکانتا دەگەڕێ و خێرای شەمەندەفەر زیاتر و زیاتر دەبێت، گەرمی وەک پزیسکی بێ ئازاری ئاگری نیگارکێشان، لە پەنجەکانی دەست و پێت و لاگوێ و تەنانەت کەمەرت جێ دەمێنێت.

شەمەندەفەر هێندە خێرا دەڕۆیشت کە من وام دەزانی ئێستا ئیتر بەکۆتایی دنیا دەگەم، کەچی نەگەیشتم، لەچەمەدانییەکەوە بۆنێکی توند دێت و من خۆم داوتە دەست ئەو رێگەیە. دەستم بۆ یەخەم برد کلیلی ماڵەکەی ئەو، لە نێوان مەمکەکانمدا بوو، بۆ ساتێک هەستم کرد کلیلی ماڵی قەمبوورە.. رەنگە.. رەنگە.. رەنگە.

نازانم بۆ کاغەزی قەدەری من وەکو ئەو کاغەزانە وابوو کە لە فڕۆکەوە

هەڵدەدرانە خوارێ، کاغەزانێ سەوز و سپی و سووری "جاویدشا"، من هەمیشە کاغەزە سوورەکانم دەگرتەوە و کەسانێک هەبوون کە هەموو ڕەنگەکانیان دەست دەکەوت. لە کوێوە هاتبووم وا شێوەم لە هیچ کەس نەدەچوو؟

دەهات بەبیرتدا کە ئەگەر بتزانیبایە من کێم و لە کوێم، نامەیەکت بۆ دەنووسیم.. بۆ نامە؟ ئەگەر بزانیت خۆت نایەیتە سوراخم؟ هێزێکی خۆنەویستانە تۆی لە شوێنی خۆی هەڵکەند، خێرا ڕۆیشتی بەلای جل و بەرگەکانتەوە و چاکەت و پانتۆڵت لەبەرکرد و بوینباخێکی سەوزت بەست، عەترت لەخۆت دا، کاتێک ویستت بکەویتە ڕێ، بیرت کردەوە دەبێ بۆ کوێ بڕۆیت؟ هەمووان تووشی ئەم حاڵەتە دەبن، وەلێ وا خۆیان نیشان دەدەن کە بەم شێوەیە نەبووە، حازر دەبن، کڵاو دەکەنە سەریان، پێڵاو لەپێ دەکەن، بۆنی خۆشترین عەتر لە خۆیان دەدەن، هێندە سەرگەرمی خۆڕازاندنەوە دەبن، کە بیریان دەچێتەوە بیر لە ڕۆشتنەکە بکەنەوە، پاشان کە دەیانەوێت بکەونە ڕێ، دیوارەکانی ناوەوەی کە لە سەریان یەک بەدوایەکدا دادەچێت و ئەوەندە تەپوتۆز دەکات کە هیچ شتێک بەزەینیاندا نایەت، خوابکات کەسێک بەبونیام بڵێت بۆ کوێ دەچێت؟ من لەزەینتا وتم شەشت ساڵ بگەڕێرەوە دواوە و وەرە بەردەم من، بەڵێن دەدەم کە هەردووکمان لە سەرگەردانی ڕزگار ببین و تەنانەت ئەگەر بۆ دەقیقەیەکیش بووە لەمانای ژیان تێ بگەین.

وتم"دێیت یاری یەکبین؟!" بەڵام هەرچەندت کرد نەتتوانی، مەگەر دەبوو؟ تازە ڕۆیی ئەو زەمانەی کە کەسێک مووی سیمرغی دەسووتان و دەستبەجێ سیمرغ دەهاتە بەردەرگەی، تازە ئەوە نابێت. تەنانەت ئەگەر ئەم شەمەنەفەرە بەوپەڕی خێراییش بڕۆشتایە، جارێکی تر من بەتۆ

نەدەگەیشتم، بەڕاست ئەم شەمەنەفەرە بۆ کوێ دەچوو؟

بلیتەکە لە بەینی پەنجەکانمدا مابووەوە، لەو رووناکییە کزەی لە سەرەوە دەهات، وا دەهاتە پێش چاوم کە شتێکی لەسەر نووسراوە، بەڵام هەرچەندم کۆشا نەمتوانی خەتەکەی بخوێنمەوە، لەپڕ دەنگی پێکەنینە ترسناک و وەحشییەکەی پیرەمێردی قەمبوورم بەسەردا رژا، وام زانی ئەو دەنگەم لە زەینمدا بیست، بەڵام کاتێک سەرم بەرز کردەوە بینیم لەسەر کورسی تەنیشت دەرگەکە دانیشتووە و بەدەموچاوێکی گوشراوەوە بەمن پێ دەکەنێت، بەددانی رەشەوەبووی، قژی چڵکن و پێکەوە نووساوی، خۆی لە عەبایەکی ئۆخرایییەوە[*] پێچابوو نەیدەتوانی بەر بەپێکەنینەکەی بگرێت.

من خۆم نەدۆڕاند و هەوڵم دا بەسەر خۆمدا زاڵ بم، بەڵام گیرم خواردبوو، دەستەکانم بەگوێچکەمەوە نووساند و زریکاندم، وا کە تەواوی بەدەنم کەوتە لەرزین، بێ ئەوەی دەنگێک لە زارمەوە بێتەدەر، تەنیا ناڵەیەکی بچووکی خۆمم بیست، پاشان هەستم کرد کە کۆمەڵێکی بێشومار خەڵک بەناو سەرمدا دەڕۆن و قسە دەکەن.

وەک ئەوەی کۆمەڵێک خوێندکاری سادیستی کتێب بەدەست، بەدەنگی بەرز هاوکێشە لەبەر بکەن، لێ دەنگی هیچیان روون نەبوو، روومەتم رنی و ئەوەندە بەهێز یەکێک لە پەنجەکانم گەست کە خوێنم لێ هێنا، ئینجا پیرەمێرد بێدەنگ بوو، بەتووڕەییيەوە وتی "خۆ تۆ برینداربوویت..

---

(*) ئۆخرا: ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا یۆنانییە، بەجۆرە خاکێک دەوترێت کە رەنگی جۆراوجۆری لێ دروست دەکرێت، خۆی رەنگێکی زەردی مەیلەو سوورە. و

دەسرت بدەمێ پێی ببەستی؟" دەسرێکی چڵکنی لە گیرفانیدا دەرهێنا و بەرەو رووم گرتی.

وتم "بۆ ئەوەندە دووبارە دەبیتەوە؟ تۆ کێیت؟"

وتی "تەنیا موسافیری ئەم شەمەنەفەرە تۆیت.. هااا؟"

وتم "یانی چی؟"

وتی "جگە لە تۆ هیچ کەسێک لەم شەمەنەفەرەدا نییە، حەز دەکەیت برۆ سەیر بکە"

وتم "بەڕاست؟"

لە شوێنی خۆم هەستام، دەرگەی کابینەکەم کردەوە و لە ڕاڕەوەکەدا دەستم کرد بەگەڕان، جێگە جیاجیاکان گەڕام و سەرم بەهەموو کابینەکاندا کرد، کەسی لێ نەبوو، جارێکی کە چوومەوە. ناوەوەم دەیقیژاند، بەڵام دەنگم لێوە نەدەهات. ئایا لە شاخێکەوە دەکەوتمە خوارەوە؟ ئایا لە بیرێکی بێ بندا نقووم دەبووم؟ ئایا خەریکە لە رەحمی دایکێکەوە بێمە دەرێ کە دەبوو بەهەنسک هەڵدان و هەراسان، یەکپارچە بمدایەتە قووڵپی گریان؟

چەند سەخت بوو! دەنگی زریکەی ناخم لە کاسەی سەرمدا هەست پێ دەکرد و هەڵدەهاتم، لە شتێکی نەناسراو هەڵدەهاتم تا پەنا ببەمە بەر نەناسراوێکی تر. بەیادی ساڵانی دوور لە کۆمەڵێک تونیی هەڵدەهاتم، بیرم کەوتەوە کە دەست بەژێر مەمکەکانمەوە بگرم نەبادا بکەوێت.

ئەستێرە چکۆلەکان ڕێک لە بەرامبەر چاوەکانی مندا دەسووتان و ون دەبوون، بەڵام ئەستێرە سپی و زیوییەکان بەنێو یاریی ئەستێرە

چکۆلەکاندا هێورهێور بەڕێی خۆیاندا دەڕۆشتن، پێکوتە و سەنگین لەسەروو کەهکەشانەوە وەستابووم و بەڵام دەستم لە ژێر دەسەڵاتمدا نەبوو کە بەپەلەپیتکەیەکە بتوانم ئەستێرەکان لە یاری بکەمە دەرەوە، هیچ شتێک لە ژێر دەسەڵاتمدا نەبوو، چەند سەخت بوو، چ قورساییەک بەکۆڵمەوە بوو! بۆ ژیانکردن نا، بەڵکو تەنیا بۆ زیندوومانەوە، دەبوو چ پەلەقاژەیەک بکەم، چ مەرگم بوو؟ نازانم تەنیا دەزانم کە شتێک منی هەراسان دەکرد و موگناتیسێکی نەناسراو منی بۆ دواوە رادەکێشا، ئەوەندە بۆ دواوە گەڕامەوە تا گەیشتمە کۆتاییی شەمەنەفەرەکە، بۆ دڵنیابوون دەستم لە دوایەمین دیواری شەمەنەفەرەکە دا و لە پێ کەوتم، هەناسەسوار و تۆقیو سەرم داخستبوو نەبادا چاوم بەدەرەوە بکەوێت.

ئێستا ئیتر لە پەنجەرەکانیش دەترسام، کە دەتگوت رەشایی دەرەوەی بۆشاییەکی بێ کۆتایین، ئەگەر بکەوتمایەتە راکێشانەکەیەوە، تا ئەبەد لە ناخەوە دەمقریشکاند بێ ئەوەی دەنگێک لە زارمەوە بێتە دەرێ.

وەک بڵێی پێم نابێتە دنیایەکی نەناسراوەوە کە عەردی نەبێت، من بێ ئەوەی بمرم وەک روحێکی سەرگەردان یان روحێکی گەڕیدە لە ئاسماندا تیامابووم، وەحشەتێکی گەورەتر لە مەرگ وجودی گرتبووم، بۆ ساتێک هەستم کرد تەواوی تۆقینی من لە تەنیاییە، لە تەنیا مردن نەدەترسام، لەوە دەترسام بەتەنیا بمێنمەوە، چەند لە پەستا پەستا دەمقیژاند، رق قووڕگمی گرتبوو، هەناسەم تەنگ، کاتێک فرمێسک بەچاومدا هاتە خوارێ هەستام دەستم لە خۆمەوەدا تا بزانم هەم، ئەوکاتە کەوتمەڕێ.

هەموو کابینەکان خاڵی بوون، من فیکەم لێ دەدا، دەشگریام، کەچی

ئەم دڵە ساحەب مردووەم ئارام نەدەبوو، قوورگم گیرابوو، فیکە، گریان، فیکە، فیکە، فیکە، بریا بمتوانیایە لە جێی گریان فیکەم بکێشایە، وەک ئەو ئاوازەی کە دواتر پیاوە نابینا بەویقارەکەی بەردەم قاوەخانەی فیردەوسیی بەئۆکۆردیۆن دەیژەنی.

وتی "ئەم ئاوازەم، لەسەر فیکەی شەوانەی مەستێک داناوە"

وتم "جوانە"

"بەدڵنیاییەوە تۆش جوانیت"

"خۆزگە بتتوانیایە بیبینی"

"من ئەهلی تەماشا نیم.. ئەهلی ئاوازە خەمگینەکانم"

گریام و فیکەم دەکێشا، هیچ کەسێکی لێ نەبوو، هەموو کابینەکان خاڵی بوون، بەدوای پیرەمێردە قەمبوورەکەدا دەگەڕام پەنای بۆ بەرم، بەڵکو لە کەناریدا ئارام بگرم، بەڵام ئەویش نەبوو، لە کوێی پیرەمێرد؟ نەبوو.

چەند رۆیشتبووم؟ دیسانەوە دەستم پێ کردەوە، لە کابینەکەی خۆمان دەرچووم، بەیەکەمین فارگۆن گەیشتم، چوومە ژووری ئیشپێکردنی ئامێرەکان، دەرگەی کابینەکەم کردەوە، کە پێم خستە ئەودیوەوە ئینجا زانیم کە شەمەنەفەرەکە بێ شۆفێرە، لەوێ بوو زانیم هێزێکی پەنهانی شەمەنەفەرەکە رێنوێنی دەکات، بێ ئەوەی کەسێک سووتەمەنی تێ بکات، یان کەسێک لێی بخوڕێت.

دەنگی سەرسوڕهێنەری ئامێرەکان ئاماژەی خێراییەکی نائاسایی بوو، دوو کورسی لەوێدا بوو کە هەردووکیان خاڵی بوون، پەروانەیەک بەتەلبەندی پەنجەرەی دەستەڕاستدا وشک بووبوو، کابینەکە بۆنی دەمی

مردووی لێ دەهات، دەمی مردوویەک کە بەسەدرو کافور(*) دەیشۆن و پانکەیەک بەتەواوی هێزییەوە دەخولێتەوە تا جەستەکە بۆگەن نەکات. وەها سەرم گێژبووبوو کە نەمدەتوانی بەسەرپێوە بووەستم، حەزم دەکرد دانیشم و گرمۆڵەببم، وەک کۆیلێک بخولێمەوە، سووڕاو بێدەنگ لە سوچێکەوە بکەومە دەرەوە، بەشێوەیەک کە کەس نەمبینێت. وەلێ هیچ توانام نەبوو، مات و بێدەنگ لە بەدبەختی خۆمم دەڕوانی، بەچارەنووسی شوومم، کە ئەو هەموو رێگەیەم بەئیرادەی خۆم هەڵبژاردبوو؟ سات بەساتیش واقی من زیاتر وڕ دەما، ئایا کەس باوەڕ دەکات؟ ئایا تۆ باوەڕ دەکەیت؟ دەتوانیت پێم پێ بکەنیت، یان بەچارەنووسی خەمئەنگێزم بەڵپبگری، بەڵام ئەگەر چاوێک بەخۆشتاندا بخشێنن، بۆتان دەردەکەوێت کە حاڵتان لە من باشتر نییە، بێهوودەیە کە بپرسم ئێوە بۆ؟ چونکە نەک تۆ هیچ کەسێک پەرسڤێکی نییە، مرۆڤ رۆژێک بەبینینی دووچاوی رەش ژێرەوژوور دەبێت، بیری لێ دەکاتەوە، هەموو شەوێک خەوی پێوە دەبینێت، دوو مانگ و چوار رۆژ بەدوایدا دەگەڕێت، وەختێ بەدەستی دەهێنیت، بۆی دەردەکەوێت کە تەرمێکی بەسەردەستەوە ماوە.

نا.. تۆش بێ گوناهیت هێندە بیر مەکەرەوە و لەسەری مەڕۆ، بگەڕێرەوە. خێرا گەڕامەوە کابینەی ژمارەی بیست و چوار، لە

(*) سەدر و کافور: سەدر دارێکە لە ناوچە گەرمیانییەکاندا دەڕوێت و گەڵاکەی وشک دەکرێت بۆنێکی خۆشی هەیە، کەف دەکات و لە خۆشۆردندا بەکار دێت. هەرچی کافوریشە؛ گیایەکی بۆنخۆشە، لە پزیشکی و پیشەسازیدا بەکار دەبرێت. هەردووکیان بەشێوەی گوڵاو بەلاشەی مردوودا دەکرێت، تا بۆنی مردووەکە بشارێتەوە. و

شوێنەکەی خۆمدا دانیشتم و ویستم وەک دەسپێکی سەفەرەکە لە ڕەشایی دەرەوە بڕوانم، بەڵام ئیتر نەمدەتوانی، سەیری ژوور سەری خۆمم کرد، چەمەدانییەکە نەمابوو، کەسێ پڕی دابوویە و بردبووی، کەسێک گاڵتەیەکی بێ تامی لەگەڵ کردبووم، دەستم گرت بەدەموچاومەوە و بیرم لەوە کردەوە کە نابێت لەوە زیاتر هەڵپە بکەم.

تێگەیشتم کە زۆر شت بەدەست مرۆڤ نییە، ژیان خەونە تێپەڕیوەکانە و تەفسیر دەکرێت، ژیان جۆلانەی خەیاڵی ڕۆژانێکە کە هەرگیز تەمەنمان پێی ناگات، ژیان دەستپێکی سەربردەکانە. دەمویست حەواسم کۆ بکەمەوە و یەک جار بەڕابردووم یان ئاییندەمدا تێپەڕم. دەزانم کاتێک بوونیام بەڕێدا دەڕوات قاچێکی پێش دەکەوێت و قاچێکی دوا، وەختێک دەوەستێت وەک پەروانە بەقوتوی ئاوێنەیەکدا بەدیوارەوە دەدورێت، بەڵام گێژ بووبووم، نەمدەزانی بگەڕێمەوە بۆ رابردوو یان بیر لە ئاییندە بکەمەوە، لەخۆوە بیرم کەوتەوە زەمانێک لەسەر چرپا چڵکنەکە نووستبووم و دوو مۆمدانی کۆن بەژوورسەرمەوە بوو کە خەرمانەی تەواونەکراویان دەخستە سەر دیوارەکە، هەرچەند پێویست بەبوونی ئەو دوو خەرمانەیە نەبوو، بەڵام بۆ پیرۆزکردنی ئەو ساتە بێگەردانە دیواری بەرامبەر وەکو میحرابی لێ هاتبوو، دوو میحراب لە توێی یەکتردا، لە ناویاندا ڕووناکییەکی سەوز دەگەڕا، لە ژێر ئەو گڕە سەوزەدا، گەنجێکی کاکڵ پەرێشان تاری دەژەنی و بۆنی شەراب لە زاری دەهات، دەیانگوت کە شێخ کۆڵان بەکۆڵان گەڕابوو تا ئەوی دۆزیبووەوە، وتبووی: کوڕە بەلاڕێدا مەڕۆ! لاوەکە لە حەژمەتدا وتبووی چی بکەم؟ شێخ وتبووی لەگەڵ ئێمە وەرە. تا بەیان ئەنگوتبوو شێخ موناجاتی خوێند و هوهای کێشا، گەنجە لاوازەکە زۆر برسی بوو،

خۆشی نەیزانیبوو، تاری دەژەنی و بۆنی شەراب لە هەناسەی دەهات، کە سپێدەی دابوو ئەو لە برسان گیانی سپاردبوو، شێخ فیغانی کرد کە ئێمە حەفتا ساڵ....

سەرم راوەشاند تا وێنەی ناوزەینم بگۆڕێ، شەمەنەفەر تەکانێکی توندیی دا و بەئاژێر لێدانەوە خێراییەکەی کەم بووەوە، هەموو شتێک لەو تاریکییەدا ئارام بوو، ریتمی توندی چەرخەکانی هێواش بووەوە و شەمەنەفەر وەستا، بێدەنگییەک باڵی کێشا کە بۆنی دڵ لەسەر خۆچوونی دەدا، تامی سکەکانی عەهدی دەقیانووس لە دەمدا، تامی تفتی مەرگ.

چەند حەزم لە کانادا کردبوو، حەزم دەکرد خۆر گەرمتر بێت، هالاوی گەرمی لە چاوەکانمەوە بێتە دەرێ و کەس لە کۆڵان نەبێت، کەی بوو؟ تۆ بیرتە؟ کانادایەکم کڕی و لەسەر قادرمەکانی ئەودیو دەرگەی حەوشەوە دانیشتم و دەمم بەلێوی شووشەکەیەوەنا، پاسکیل سوارێک بەکۆڵاندا تێپەڕی و من دەمخواردەوە، پەپوولەیەک باڵەفڕەی بوو، لە دیواری پرگوڵی ماڵانی بەرامبەرەوە بەرەو رووی من هات و دوورکەوتەوە، من دەمخواردەوە. سەرم بەرز کردبووەوە و بەهەردوو دەست ئەو شووشە ساردەم گرتبوو کە نەبادا بکەوێت، پاشان هەناسەیەکی نوێم هەڵکێشا، بەم سەراوسەری کۆڵاندا چاوێکم گێڕا نەکا تینووەکان بگەن، جارێکی تر خواردمەوە، دەنگی رادیۆ دەهات، هەڵبەتە دایکم نووستبوو، خەڵکی گەڕەک نووستبوون، هێشتا جەناب سەرهەنگی دراوسێمان نەگەڕابووەوە، رۆژنامە بەدەست، بەدەم عارەقڕشتنەوە، تینوو.

هێشتا "باسی" ئەو کوڕێژکە رەشتاڵەی چاوانێکی بریقەداری هەبوو، لە پەنجەرەی ماڵە بەرزەکەیانەوە چاوی دەبڕییە حەوشەکەی ئێمە،

نەهاتبوو تا لە بەرامبەرم بوەستێت و لە قاچە درێژە و باریکەکانم بڕوانێت و دواتر هێواش کۆشم هەڵبداتەوە و سەیری بکات، هەرچەند بیرم کردەوە مانای ئەم کارە تێنەگەیشتم و دوای ئەوە هەرگیز ئەو کوڕە جارێکی تر لە پەنجەرەکەیانەوە سەیری حەوشەکەمانی نەکرد، بۆ کوێ چووبوو؟ ئایا وای خەیاڵ کردبوو، کە من شتێکم لەو دزیبوو لە ژێر کۆشمەوە شاردبوومەوە؟ وتی پەروانە و پەروانەیەک دای لە باڵ و بەسەرمانەوە فڕی.

هێشتا کاناداکەم تەواو نەکردبوو کە بێدەنگییەکی سەیر سەرتاسەری کۆڵانی تەنی، لەو بێدەنگییەدا بوو من ئاگایانە خەوتم، یان رەنگە لە خەوێکی درێژ وەخەبەر هاتبم تا ئارام بگرم، کە چاوم کردەوە رۆژ بوو، من لە شەمەنەفەردا نەبووم، خۆرەکەی زۆر گەرم بوو، عەرد قڵیشی ترسناکی تێ بووبوو، بیرم نییە کە دڕکوداڵ بوو یان مێرگ، کوێرە شوێنێک بوو کە ژنانێکی بێشومار سەرقاڵی کاربوون، ژنانێکی رووت کە مەمکە شۆڕەکانیان دابوو بەشانیاندا تا بەردەستیان نەگرێت، بەداسی گەورە درەویان دەکرد و دەچوونە پێشێ، کە باش لێم ڕوانین هەموو ژنەکان خۆم بوون، خەریک بوو شاخم لێ بڕوێت.. من؟ یانی مەمکەکانم ئەوەندە کشابوون کە ناچاربووم بیاندەم بەملاولای شانمدا؟ ماندوویەتییەک لە کەللەی سەرمەوە دەستی پێ کرد کە تانوکی پێم دەهات و دەچوو. ئایا ئەم هەموو ژنە من بوو؟ مەگەر دەبوو؟

یەکێک لە ژنەکان کە منی دی لێم هاتە پێشێ و وتی "لێرە لەگەڵ ئێمە دەمێنیتەوە؟"

"من؟ نا.. دەمەوێت بگەڕێمەوە"

وەک هەویر لە ژێر ئەو گەرما بەتینەدا کشابوو، وەک دڵۆپی مۆم قەترە

قەترە تکا، نەمتوانی لێی بڕوانم، رووم وەرگێڕا، لەپڕ شەمەنەفەرێکم بینی لەولاوە وەستابوو، پیرەمێردێکی قەمبوور دەرگەی یەکێک لە فارگۆنەکانی کردبووەوە، بەدەست راوەشاندن دەیویست شتێک بڵێ، پێم هەڵگرت و بەرەو رووی رام کرد، کاتێک گەیشتمە لای شەمەنەفەرەکە وتی "خەریک بوو جێ بمێنی.. هااا؟ ئەگەر من نەهاتمایە خوا دەیزانی چی رووی دەدا" سواربووم و خێرا خۆم گەیاندە کابینەی ژمارە بیست و چوار، لەسەر کورسییەکەی خۆم دانیشتم، بێ ئەوەی نیگایەکی دەرەوە بکەم، بڕیارم دا ئیتر لە جێی خۆم نەجووڵێم، شەمەنەفەرەکە فیکەی کێشا و کەوتە رێ، من هەستم بەئارامی کرد، بەڵام سەرتاپای گیانم هاواری دەکرد، دەتگوت لە چەند لایەکەوە رام دەکێشن و ئێسقانەکانم لەیەک جیا دەکەنەوە، دەتگوت قژم دەسکەنە دەکەن و ئەندێشەم پارچەپارچە، پارچەپارچەیەکی پەڕاگەندە کە هەریەکەی لەلایەک کەوتبوو، سەرمام بوو، موچووڕکەم پێدا دەهات، دواتر یەکبارە گڕم گرت.. چ مەرگم بوو؟

ئایا بۆ ئەوەی ئارامی بەدەستبهێنم دەبێت بیر لە سالانی دواتر بکەمەوە؟ بۆ ناتوانم حەواسم کۆ بکەمەوە، لەرزیو و فڕەفڕ لە زەمەندا خول دەخۆم. دەنگی باسی دەژنەڤم کە دەڵێت پەروانە و من وەک پەروانەیەک لەم زەمەنەوە هەڵدەفڕم و دەچمە زەمەنێکی تر دەنیشمەوە، لەسەر ئەم قەڵەمدانەوە بۆ سەر ئەو قەڵەمدان.

ئایا دیسانەوە دڵم بۆ باوکم تەنگ بوو؟ ئایا پێویست بوو لەبەر مۆڵەتی چەند مانگێک، کۆشم بۆ خاوەن ماڵەکەمان هەڵبدەمەوە و بڵێم "زۆر باشە"؟ یان دەردی من پێوەندیی بەسالانی دواترەوە هەبوو؟ ئەوەندە پەرێشان بووم کە نەمدەزانی، لەپڕ شتێک لە زەینمەوە فڕی و دڵم

لەسەرخۆچوو، دەنگی دوورەدەستی ئۆکۆردیۆنی پیاوە نابیناکەم بیست، پیاوێک وەک ئەوەی بیەوێت مەسەلەیەکی گرینگ بسەلمێنێت، بەبڕوا بەخۆبوونێکی تەواوەوە لە ژێر لێوەوە دەیچڕی "ئەی ڕۆژگاری نەخش و نیگاران" رق قورگی گرتبووم، خۆنەویستانە جانتاکەم هەڵگرت، بەقاردمەکانی قاوەخانەی فیردەوسییدا چوومە خوارێ، چوومە دەستشوییەکە، دەرگەکەم بەسەر تۆدا قفڵ کرد.

سەیرێکی خۆمم لە ئاوێنەکەدا کرد تا بزانم چەندساڵم؟ چەند ساڵ بەسەر ئەو ساڵانەدا تێپەڕیوە کە تەرمێکم بەدەستەوە مابوو؟ ویستم ببینم ئایا دەکرێت بیری خۆم بێنمەوە ڕۆژێک لە ڕابردوودا بەسواری شەمەنەفەرێک لە تاریکیدا بۆ شوێنێکی نادیار دەڕۆیشتم؟ سرنجم پڕکردوو چەقاندمە دەمارم، بەڵام دیسان دەستم رووشا و چەند دڵۆپە خوێنێک تکایە سەر عەردەکە، ئێستا بەئاسانی دەنگی ئۆکۆردیۆن دەبیسترا، من چاوم پڕی بووە دڵۆپە خوێنەکان کە نهێنی ئامێز و خۆڵەمێشی دەیاننواند، بیرم کردەوە بۆ خوێنی من سوور نییە؟ دەستم بەلێواری دەستشۆرەکەوە گرت تا نەکەوم، قاچەکانم دەلەرزین، پاڵم بەدەرگەکەوە دا و دواتر وەک چرا داگیرسام، وتم "بۆ ئێوە؟"

بابەتی داڕشتنی من وەک هەمیشە هەڵیتوپڵیت بوو، من قسەی دڵمم نووسی، نووسیم قەمبوورەکان تلیاکی بوون و ئێمەی قەڵەمدانییەکانیش هەموو عارەق خۆر، لێ زۆری نەخایاند کە ئێمەش ڕوومان کردە تەزریق و مۆرفین، ئێمە لە کەڵک کەوتبووین و کەس نەیدەویست گوناهمان لە ئەستۆ بگرێت، مامۆستای داڕشتنمان پیرەمێردێک بوو، چاوی ئێمە بوو، هاتبووە بەر هەیوانی ژووری ئۆفیس تا لە ناو ئەو هەموو کچە سوورمەیی پۆشەدا من بدۆزێتەوە، منیش نائومێدم نەکرد، بەرەو رووی

رۆشتم و وتم "ئاغا.. بەدوای مندا دەگەڕێیت؟"

"بەڵێ.. بەڵێ گیانەکەم"

لە قادرمەکان هاتەخوارێ و وتی "ئەو دارِشتنە خۆت نووسیوتە؟"

من شــەیتــان بووم، چەند جــارێک بەســەر و قــەلافــەتە کــوڵەکــەیمدا هەڵڕوانی و نیگایەکی پێکەنین ئامێزم رشتە چاوەکانییەوە، ویستم بڵێم دڵسۆزی جەنابتم، بەلام لە دەمم دەرپەڕی:

"بەچکە مراوییە ناشرینەکە"

هەردووکمان پێکەنین، وتی "ئەی هاروهاج"

ســـەعـــاتە زیوییـنەکـــەی بەرباخـــەڵی دەرهـێنا و وتی "زۆر بـاشـــە.. نووسیوتە قەیدی نییە، بەلام ئیتر لەم شتانە مەنووسە"

زەنگی وانەی ســێــیــەم لێ درا و من دووبارە تێکەڵ بەســـوورمـــەیی پۆشــەکــان بووم، تــا کــەس نەزانێت چ حــاڵێکم هەیە، وەک ئەوەی هەڵەم کردبێت.

دەنگەهایەکم بیـــست، تەق.. تەق.. تەق.. تەق، دەنگی پێـــلاوە پاژنە بەرزەکانی خۆم بوو؟ لە ژوورێکی گەورەدا دەرۆشتم و کوڕێک دەگریا و لە باوەشـمدا دەسـتم بەڕوویدا دەهێنا، کە هەنـاسـەی دەیدا لە گـەردنم حــاڵێکی خۆشی دەدامێ، منیش بەهێواشی دەمکێشا بەپشـتیدا و رام دەژەند، ژیر بووەوە و خەوی لێ کەوت، منداڵی خۆم بوو، بەلام کەی ئەوم بووبوو؟ لیکی بەسـەر گـەردنمدا دەرژا و هێزی دەدامێ کـە دیسـانەوە بڕۆم.

حـــاڵێکی خـــۆشم هـەبوو، لەو ژوورە گـــەورەیەدا بەو پێـــلاوە پاژنـە بەرزانەوە دەڕۆشــتم کـە لەپڕ منداڵەکـەم مـیـزی پێدا کـردم و هـەمـوو

جلەکانمی تەڕ کرد، لە دڵی خۆمدا وتم بەخێر نەیەمەوە، بۆ بیرم چوو دایبی پێ هەڵگرم. ئەگەر ئەم شتانەم لە خەودا ببینیایە وا لێک دەدرایەوە کە میز مانای سامانی زۆرە، بەڵام چ سوودێکی هەبوو کە هەموو شتەکان لە بێداریدا روویان دەدا.

منداڵەکەم لەسەر عەردەکە راکێشا، دەرپێکەیم داکەند و بۆ ئەوەی دایبی پێ هەڵگرم. سەیرم کرد منداڵەکەم ئیتر منداڵ نەبوو، پیاوێک بوو، بەهەمان کڵاوی شاپواو بۆینباخی باریک، بەهەمان چاکەت و پانتۆڵی خۆڵەمێشی خەتخەت، کە چاوی بەمن کەوت کڵاوەکەی لە سەری داگرت و کەمێک بەفیزەوە نوشتایەوە.

گێژ و مەنگ سەیری پەڵە خوێنەکانم دەکرد، سرنجەکەم لە دەستم دەرهێنا و سووتانێک بەلەرزەوە نیشتە سەر رووی پێستم، چاوەکانم داخست دەنگی خێرا و یەک ریتمی شەمەنەفەرم کەوتە بەرگوێ. ترپەی دڵم ئاسایی بووەوە، دەنگی تەپڵی گەورە و بچووک دەهات، هەموویان پێکەوە بەسەروایەک.

کە چاوم کردەوە شەمەنەفەر لە تاریکدا دەڕۆیشت و من سەرم نابوو بەشووشەی پەنجەرەکەیەوە، دەرەوە تاریک بوو، هەستم بەئارامی دەکرد، هەمان ئەو شتەی تۆ ئاهت بۆ هەڵدەکێشا و لێی مەحروم بوویت، باش دەتزانی ئەگەر دڵت بەو ژنە نەدۆڕاندابا، ناچار نەبوویت بڕی تلیاک و مەشروبەکەت زیاد بکەیت.

ئەوەندە قەرزاری خۆت بوویت کە نەتدەتوانی لەبەر ئاوێنەدا سەر بەرز بکەیتەوە و سەیری خۆت بکەیت، ئایا ئەم قەرزارییە لە بەئاسانگرتنی تۆوە هاتبووەکایەوە؟ رەنگە وابێت و رەنگە واشنەبێت، ئایا گوناهت کردبوو کەسێکت خۆش دەویست؟ ئەویش قەحبەیەک کە شوێنێکی بۆ

غرور و کەرامـەتی تۆ نەهێشتبووەوە. وتم دەزانیت ڕێگەی کۆتایی چییە؟ تۆ سـەرت بادا یانی کە نا، گوتم بەدەرزییەک هەمـوو مـەسـەلەی تۆ حل دەبێت، تـەزریق دەزانیت؟ ئـەگـەر ناچاربیت فـێـر دەبیت و ئـەگـەر فـێـر نەبوویت، هـەر کاتێک ناچار بوویت بیوەشێنێ و تەزریق بکەیت، وریا بە دەستت نەلەرزێ، ئازار دەداتە پێستەکەت.

دەبینی کەوتوومـەتە چ ڕۆژێکەوە؟ تەزریقیی بووم، ئیتر بەکێشان ئێش ناڕوات، تـەنانەت تـەزریقـیش ئۆخـژنم نـادا. خـوێنبـازی دەکـەم. کـە سـرنجـەکـەم خـاڵی کـرد، ئینجـا کـەمـێک خـوێن دەردەکـێشـم و تێی دەکەمەوە، جارێکیکە کەمێک خوێن دەردەهێنم و تێی دەکەمـەوە. ئای.. ڕەنگە.. ڕەنگە. ئیشێکی بۆگەنە، گوێت لێیە؟ جەسـتەم کوتراو ماندووە، دەڵێی ئێسقانەکانم سیمکێشی دەکەن، دەڵێی پارچە پارچەم دەکەن و سـەرلەنوێ دروسـتم دەکـەنەوە، ئەوەی کـە سـەرم دەخـەمـە نێـوان دەسـتـەکانمـەوە و خـۆم ڕادەژەنم، تەنیـا لەبەرئەوەیە کە ئیـتـر نامـەوێت زەینم لەسـەر شتێک کۆ بکەمـەوە، دەمـەوێت بەبەردەوامی وێنەی زەینم بگۆڕێت، لە حـاڵی خـۆم تێ نـاگـەم؟ لە برسێتی تێ ناگەم.. نە خـەو و نە بێداری دەزانم.. ئازارم هـەیە و دڵم تەنگە.

ڕۆژێک لە برسا هـاتمە دەرێ، ڕووسەرییە مـاشییـەکەم دابوو بەسـەرما و لە ژێر گـەردنمەوە توند گـرێم دابوو، مـانتـۆیـەکی ڕەشم لەبەرکـردبوو، تەکسییەکم گرت و وتم بمگەیەنە سەنتەری شار. دووکانەکان داخرابوون و دەنگی نامـۆ دەهات، خـەڵک ڕژابووە سەر جادە و منداڵ و گـەورە و ژن و پیـاو هـەمـوو سنگیـان دەکوتا و حـسین.. حـسینیـان دەکرد، لە قـەراغ جـادەکەدا وەسـتام سـەرنجم دایە کۆمـەڵێک، کە وەک مریشکی سـەربڕاو هـەڵبـەز و دابەزیـان دەکـرد، گـریـانم هـات، لە دڵی خـۆمـدا وتم بـۆ

پێغەمبەرەکەیان ئەمە ناکەن، کەچی بۆ ئەمە بزانە چی دەکەن، جوان نییە؟

چۆن گوڕیان دەخواردەوە، برسییان نەدەبوو؟ بۆ هیچ دووکانێک نەکرابووەوە، بۆ نانەواکان نانیان نەدەبرژاند؟ لە بەردەم مزگەوتی "شوش"ەوە تێ پەڕیم، سەوزبوو، بۆنی قیمەی ئیمام حسین دەهات، بونیامی مەست دەکرد، چوومە ژوورێ، هەموو رەشپۆشانی دنیا لەوێ بوون و قاپی پڕ لە قیمە دەستا و دەستی دەکرد. هەستم بەغوربەتکرد، وەلێ دڵم دا بەدەریاوە و چوومە پێشێ، بە پیاوێک کە لە بەردەرگەی ژناندا وەستابوو، وتم "ئاغا خواردنیش دەدەیت بەمن؟" پێکەنی سەیرێکی سەرتاپامی کرد و وتی "بۆ ناتدەمێ؟.. ئەمڕۆ نابێت کەس برسی بێت" قاپێک خواردنم وەرگرت و هاتم بڕۆمەوە بۆ کۆڵانی خۆمان، ژنێک بەردەمی گرتم و وتی:

"مەگەر نەمگوت سەرت داپۆشە"

وتم "من؟"

وتی "بەڵێ قەحبە.. تۆ"

وتم "من.. خۆ نیم!"

ئەوەندە توند دای بەژێر قاپەکەمدا کە خواردنەکە رژایە سەر زەوییەکە و دام لە پرمەی گریان و کەوتمە سەر ئەژنۆ، کە بەدەست پلی گۆشتە رژاوەکەم کۆ دەکردەوە، نەفرەتم کرد، بەڵام گازێکم لە دەستم گرت و گوتم خوانەکات. تووڕە بووبووم و شتێک لە سنگمدا قورس و قورستر دەبوو، برسیم بوو، بۆنی قیمە شێتی دەکردم، پارووییەکم خستە دەممەوە، بەڵام گریان نەیدەهێشت پاروەکە قوت بدەم، تفم کردەوە. حەزم دەکرد بگەڕێمەوە، دەبوو بۆ کوێ بگەڕێمەوە؟ بۆ هەر شوێنێک

بگەڕامایەتەوە گرینگ نەبوو، گرینگ ئەوە بوو کە ئێستا نیم و نەبووم.

بەبرسێتی بۆ رۆژگاری نەخش و نیگاران گەڕامەوە، تا گەیشتمەوە ماڵەوە شەو بەسەرداهات، لە ژوورەوە لەسەرخۆ چووم، دەرگەیەک کرایەوە و من دیسانەوە لە نێوان وێنە دێرینەکاندا جێمام، قاوەخانەیەکی گەورە بەلێواری هەڵدێرێکەوەبوو کە دیوارەکانی هەمووی لە تۆڕی جاڵجاڵۆکە بوو، بۆ خۆی تابلۆیەک بوو لە تۆڕی جاڵجاڵۆکە. لە نێو ئەو هەموو تەونە نارێک و نائەندازەییەدا هەزار جاڵجاڵۆکە، ژوورێکی تەواویان دروست کردبوو، ژوورێکی پڕ لە تەم و خۆڵەمێشی، کە لە هەر لایەکەوە لێم دەڕوانی، دوایین خاڵی دنیام لێوە دەدی.

لە پشتی تۆڕەکانەوە پیرەمێردێکی قەمبوور پیاڵەی دەشۆرد و چای لێ دەنا و لەگەڵیشیاندا ئاوازێکی رادیۆکەی لە ژێر لێوییەوە دەوتەوە، ورتەورتێک کە روون نەبوو، چوومە پێشێ و بانگم کرد، دەنگی من لە تاڵ یان تۆڕی جاڵجاڵۆکەکەوە تێ نەدەپەڕی، بەڵام من ورتەورتی ئەوم دەبیست، قووڵپەقووڵپی سەماوەرەکەم دەژنەفت و کەچی هەرچەند هاوارم دەکرد ئەو نەیدەبیست، تونیم بوو، حەزم لە چا دەکرد، سەیری دەوروبەرم کرد بەڵکە رێگەیەک پەیدا بکەم، لە ناو قاوەخانەی تۆڕی جاڵجاڵۆکەدا رووبارێکی کەفکردوو تێ دەپەڕی، رووبارێکی مەرزیی لە کانییەک کە لە شوێنێکی ترەوە هەڵدەقووڵی، دەبووە حەوت لق.

پیرەمێردە قەمبوورەکە زەردەخەنەی کرد و لە ژێر لێوەوە خوێندی "عەتار حەوت شاری عەشق گەڕا ... ".

من دەنگی ئەوم بەڕوونی دەبیست، هەر لەبەرئەوەش چوومە پێشەوە و دیسانەوە بەدەنگی بەرز بانگم کرد، بەڵام وەک ئەوەی لەودیو زەمانێکی زۆرەوە لە پێش کێوێک یان دنیایەکی ترەوە بانگی بکەن. رەنگە دەنگێک

لە قورگمەوە دەرنەهاتبێت، نازانم. دام لە باڵ و بەسووكی پەروانەیەک چوومەوە سەر یادەوەرییەکان، لە رابردووەوە بۆ ئاییندە، هەروا بەو سادەییە.. بینیم کە لە سۆراخی تۆدا لە پزیشکی دادوەری لە مەیتخانەیەکدا دانیشتووم.

لە ژوورێکی گەورە لەسەر مۆبیلێکی ئۆخرایی دانیشتبووم، دوکتۆرێک بەسەدرییەیەکی سپییەوە لەودیو مێزەکەیەوە بوو، مردوویەک بەرامبەر من لەسەر دەستەبەرەیەک نووستبوو، زەوییەکە تەڕ بوو، راڕەو و سالۆنەکان تەڕبوون و لە هەر لایەکدا چەند مردوویەک خەوتبوون. زۆرم برسیبوو، هیچ رێگەیەکی تر نەبوو، من دەبا پێلاوەکانم بخواردایە، پێلاوەکانم تەڕبوو، من بنی هەردووکیانم بەیەکەوە چەسپاندو و نابەدڵ قەپم بەو پێلاوە رەشانەدا دەکرد، خەریکبوو برشێمەوە، بەلام ناچاربووم. کاتێک دوایەمین پارچەیم دەخوارد، پیاوێک کە دەستی کچۆڵەیەکی هەشت نۆ سالانی گرتبوو هاتە ژوورەوە، کچەکە سەر و قژی ئالۆسکابوو دەگریا، من قیژاندم:

"بۆ هێناوتە بۆ ئێرە؟"

وتی "ئەم کچەم نەخۆشە"

وتم "باشە.. بۆ ئێرە؟.. بیبە بۆ دوکتۆر"

وتی "نا دەیەوێت بمرێت.. هاتووە وەفاتنامەکەی بۆ دەربکەم"

وتم "خۆ هێشتا نەمردووە"

وتی "دەیەوێت بمرێت، ئەسڵەن حاڵی باش نییە، کە مرد من بەچ شێوەیەک تەرمەکەی بهێنم بۆ ئێرە؟ سەرەڕای ئەمە چی لە سەرەکە بکەم؟"

کچەکە ئەسکەناسێکی بیست تومەنیی لە دەستا بوو، حەزی دەکرد بیگۆڕێتەوە بەئەسکەناسە پێنج سەد تومەنییەکەی دکتۆر. دوکتۆر ئاوڕێکی دایەوە بۆ لای من "ئیشی چی بوو؟" وتم قەڵەمدانیی بوو، دەزانیت من لە شەست ساڵ پێش ئێستاوە بەدوایدا دەگەڕێم، تۆش دەیناسیت؟ سەرم خستە ناو دەستەکانمەوە خۆم راوەشاند تا وێنەی ناوزەینم بگۆڕێت.

گوتم بەدەرزییەک کۆتایی بەمەسەلەکە بهێنە، هەندێک کات بۆ ئەوەی شتێک بمێنێتەوە دەبێ قوربانیی بدەیت.

وتت "وازام لێ بێنە"

وتم "من؟" بەڵام تۆ نەتبیستوو من زۆر نیگەران بووم.

وتت "تکا دەکەم"

قەحبەکە پێکەنی و وتی "خۆت بکوژە تا وازت لێ بهێنم"

"چۆن؟"

"بەدەرزییەک"

تۆ لە تووڕەییدا دەلەرزێیت و وتت "لێرە بڕۆ"

وتی "تۆ لێرە بڕۆ" خێرا خێرا هێلکەی دەشکاند و چاوەکانی خڕ بووبووەوە.

وتت "تۆ قابیلی باشبوون نیت.. حەسوودیت.. بەغیلیت.. بێ ماریفەتی.. تێ دەگەیت؟ من دڵنیام بەدەستی کەسێک زەربەت خواردووە، حەز دەکەم بزانم بەدەستی کێ؟ بڵێ؟ بڵێ ئەسڵەن تۆ کێیت؟ لە کوێوە هاتووی؟ بەدوای چیدا دەگەڕێیت؟"

"بەتۆ چی؟"

دەتویست لەکۆتاییدا لەسەرخۆ و بەئەدەبەوە قسە بکات، دەتویست پێش هەر شتێک ئینسان بێت، وەلێ ڕۆژ بەڕۆژ دەبەنگتر دەبوو، لەسەر شان و لاملیت ڕوانی، کە وەک ژنانی پێش مێژوو، لە پەڵە و چڵکدا گەڕ بووبوو.. بەپێکەنینەکانی.. بەجوڵەی دەستەکانی.. بەنیگاکردنیدا کە ئیتر هیچیان ژنانە نەبوون، ناسکییەتی تێدا نەبوو، لە ئاژەڵێک دەچوو کە تەنیا لەبەر بەردەوامیدان بەژیان هەرچییەکی دەست دەکەوێت دەیخوات. خوێرییەکانی دەهێنایە ماڵەکە، چونکە ئەوان پێیاندا هەڵدەدا، وایدەزانی ژنە شاهەنگە.

هەرچەند ئەو دەبەنگتر دەبێت، تۆ عاشقتری دەبیت، قەڵەمدانکێش و نیگارکێشێکی دەست زبربوویت، کە ڕۆژ بەڕۆژ کارەکانت بێ ڕەنگتر و هەرزانتر دەبوو، بەڕادەیەک کە کۆپیکارییەکانت بەهەزار فرتوفێڵ بۆ ساغ دەکرایەوە، ئیتر هیچ کەسێک بۆ کارێک ڕای نەدەسپاردیت، نە وێنەیەک، نە چەمەنزارێک، نە ئەسپێک، نە گوڵدانێک، هیچ. ڕۆژەکانت ناخۆش تێ دەپەڕین، دەستت نەدەچووە هیچ کارێک، لە سستی هێندە ڕاکشاندا مابوویتەوە، کە ئەگەر لەبەر تیکەیەک نان نەبوایە هەر نەدەجولایت، بەڵام ناچار بوویت جارجارێک کتێبێک لە کتێبخانەکەتدا هەڵگریت و بڕۆیتە دەرەوە و بەبەهایەکی هەرزان بیفرۆشی، تا نانێک.. مەشروبێک یان تلیاکی پێ بکڕیت و خێرا بۆ ماڵەوە بگەڕێیتەوە.

زەمانێکت بەبیر خۆت هێنایەوە، کە کاتێک بەیانیان لە خەو رادەبوویت، بەیادی ئەو پێ دەکەنیت، ئامادەبوویت دەست بدەیتە هەر کارێک بۆ ئەوەی خۆشحاڵی بکەیت، ئایندەت بەیادی ئەو تۆمار کردبوو، زەینت بێ ئەو ئارامی نەبوو، ئایا عاشقی سیمای جوانی بووبوویت؟

ئایا له ناخی ئاگـایتـدا شــتـێک یادەوەریی هەبوو کـه نـەتدەتوانی فەرامۆشی بکەیت؟ ئایا دەترسایت کە ئەگەر ئەو لەدەست بدەیت، ناچار بیت لە شــاردا لە نێـوان ئەو هەرچیـوپـەرچیـیـانەدا دەربەدەر بەدوای عەشقدا بگەڕێیت.

چ رووی دابوو کـه وا کـەوتبـوویتـه ئەو حـاڵەوه؟ حـاڵێک کـه له خـەو و بێداریدا ترست لەو هەبوو، دەترسایت له نووستن، کـه نەبادا خەوی پێوه ببینیت و لە ترسی مـەرگ هاواری جەرگبڕ بکەیت، دەشـترسـایت بێدار بیت، کە نەبادا سـەروسـەکوتی دەرکەوێت، چونکە بچووکترین حسابی بۆ نەدەکردی، بێ ئەوەی سـەلامێکت بۆ بکات، هەروەک ئـەوەی ئەسڵـەن تۆ وجودت نەبێت، هەڵدەستا دەموچاوی بشـوات، ماکیاجێکی تۆخ بکات، جـانتـاکـەی هەڵگرێت و بۆ لای هێلکەفـرۆشێ.. سـەروپێـچـیـیـەک.. حـەسـحـەسـێک.. یان هەر نـەناسـێکی تر بڕوات، دەترسـایت لـەودیو پەنجـەرەکـەوه بیبـینیت، هەر لەبەرئەوە پەردەکـانت دادابووەوە، هـەرگـیز بەتەنیـشت پەنجـەرەکـەدا تێ نەدەپەڕیت. هـەرگـیـز سـەیری جـادەکـەت نەدەکرد، بەدەنگی بەرز بەخـۆت دەوت خۆزیا عـەشقی پیاوێک ببـووایه و یەک جـار وەک پەڵـەیەک مـەرەکـەب بتکـایەتە ژیانی پیاوێکی ترەوە، بەڵام مەگەر ئەم پەڵەیـه لە ژیانی تۆ پاک دەبووەوە؟ ئەم هـەموو تابلۆ ناتەواوەت چی لێ دەکـرد؟ دیسـانەوه دەتگوت کـەواتە بۆ نـەهات؟ بۆ درەنگکەوت؟ وای لەدەست تۆ!

ئیش و کـار و زەمـان و وجود و ژیانی لـه یەک شتدا کـورت بووبووەوە؛ ئەو.

ئیـتـر هیچ تێ نەدەگەیشـت جگە لەم ژنە، ئەم قـەحـبـەیە، ئەم سـیـحـره کەمـەعلوم نـەبوو چ ژەهرێکی له روحی تۆدا له وجودی تـۆدا رشتبـوو، کە

نەک تەنیا دەتویست، بەڵکە تەواوی گەردیلەی لەشت داوای گەردی لەشی ئەوی دەکرد، هاوارت دەکرد کە پێویستتە و ئاواتتە لەگەڵ ئەودا بەتەنیا لەم دنیایەدا بمێنیتەوە و هەمووشتێک لە بوومەلەرزەیەکدا وێران ببێت. بەڵام باش دەتزانی کە هەرچیوپەرچییەکانی ئەودیو دیواری ماڵەکەت، هەناسە دەدەن و بەڕێدا دەڕۆن، هەر جارێک ئەو ببینن کلکێکی بۆ دەلەقێنن و دەیخەنەوە داوەکە، ئەو ئاسان.. چەند ئاسان دەڕوات! خۆزگا لە بیرت دەچووەوە، دوو برۆی کەوانی، دوو چاوی رەش و ئیتر هیچ، یەک تۆپەڵ قژی رەشی شانە نەکراو و ئیتر هیچ، لێوی تەڕ و نیوەکراوە کە دەتگوت تازە لە ماچێک هەڵگیراوە و هێشتا تێرنەبووە و ئیتر هیچ؟

نا.. هەزاران شتی تر بوو کە لە بیرت نەدەچووەوە.

بەدوای مندا جارێکی تر کەوتیتەوە رێ، جلەکانت لەبەرکرد، کراس، پانتۆڵ، قەمسەڵە، کڵاوی کەپکەچ، هەمان جلی کۆن، ئایا دەچوویت پەروانە بگریت؟ خۆزیا سەرێکت لەو دۆستەمدەدا کە لەسەر پردی رۆمی ماڵێکی هەیە، لەپەروانەی رەنگاوڕەنگ، سڵاوت لە سەربازە کانزاییەکانی سەر کۆڵانەکان بکردایە تا هەست بەئارامی بکەیت، لە نێو کۆڵانی ئەو باخانەدا گۆرانیت لە ژێر لێوەوە بگوتبا، یان فیکەت بکێشابا!

کاتێک لە ماڵ هاتیتە دەرێ لە بیری ئەوەدا بوویت کە چۆن دەتوانرێت تۆ بەکارێک راسپێرن؛ ئەسپێک، چەمەنزارێک، بونیامێک، سروشتێکی بێگیان، هەر چییەک بێت بتوانێت سەرت گەرم بکات، پارەیەک بکات و تلیاک و مەشروبی پێ بکرێت و بەپەلە بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، پێش ئەوەی کەسێک بتناسێتەوە، پێش خۆرئاوابوون؟

شــەقــامی "مــەنوچەهـری" جـمــەی دەهـات و پارەگـۆڕەکـان لـەو ناوە دەخولانەوە، پارەی ئەم و ئـەویان کاش دەکرد، شـوڕوشـەوقێکیان هـەبوو، پێکەنین لەسـەر لێویان ون نەدەبوو. قـەسـابەکـان چاوەڕێی خـۆرئاوابوون بوون تا گلۆپ لەسـەر دوگی ئـاژەڵەکـانیـان هـەڵبکەن، ئۆتۆمـبیلەکـان خـاو ڕێیان دەکرد و عەرەبانەکان بەبارەکانیانەوە دەهاتن و دەچوون.

چەند دەڵاڵێک و دوو پاسـەوان لە بەردەم دووکـانی شـەربەتفرۆشـێکدا، شـەربەتی ئەفـلاتونیـان دەنۆشی و یەکێکیـان کـۆمـەڵێک ئەسـکەناسی لە دەستدا بوو بەدەم خواردنەوەوە بەدەستێک دەیژمارد. ئێمەش ڕۆژگارێک چووینە بازاڕ سکەمـان خـسـتـە دەست ئـەو پارەگـۆڕانەوە تـا بۆمـان کاشبکەن، هـەندێک زیاتر یان هـەندێک کـەمتر، جیاوازی چییە؟ بەڵام تۆ ئیتر هیچت نییە، ئەو قـەحبـەیە چەندین جـار بەتۆی گـوتبوو "ئەسپێ لە بەخاڵتا سەوزەڵە خانم دەڵێت"

لە ئاپۆڕەی پارەگۆڕەکـان تێ پەڕیت و بەئاراسـتەی قـەڵەمـدانییەکـاندا ڕۆشـتیت. دوو کـۆتر لەسـەر سـتارەیەک بەرەو لای درەخـتەکـانی ئەوپەڕی تەلارەکــە هـەڵفــڕین، ژنێکی باڵابەرز گـۆزەیەکی پڕی گـەیاندبـووە سـەر سـەکۆی بەر مـاڵیـان و سـەیری دواوەی دەکـرد، پۆلێک قـەلەڕەش لەسـەر درەخـتـێکی وشک هـەڵنیشـتـبوون، هـەڵۆیەک لـەسـەر دارێک جێـی خـۆی خـۆش دەکـرد. چوویتـە پێشـتـر، ئەو هـەمـوو تابلۆیە.. کـامـەیان ئیشـی تۆ بوو؟ هیچت لە بیرە؟ ڕۆشتیت.. چەند بێمانا!

مـاسـیگرەکانت بینی کـە عـارەقـیـان دەردابوو، لـە دەوری تۆڕی پڕ لە مـاسـی ئەڵقەیان بەسـتبوو، کـاتی دابەشکردن بوو، لەولاوە ژنێک دەسـتی منداڵێکی گـرتبــوو دارەدارەی پێ دەکــرد. پیــاوێکی مــوو بۆر عــارەقی ناوچـەوانی دەسـڕی و بـێ ئەوەی گـرینگی بـەتۆ بـدات چاوی بڕیبـووە

خێراوێک، یان ڕەنگە لە چوارچێوەیەکی قاوەییدا جێگیر بمێنێتەوە. گەیشتیتە هونەرستانی "ئیرۆمیان" و لە پێشیاندا وەستایت، ئەسپەکان بەحیلەکێشـان لە چوراچێوەکەوە غاریان دابووە دەرێ و پیاوێک کە بەدوایاندا رای دەکرد، بەهەناسەبڕکێوە گەیشت، دەستی بەشێوەی چەتر لەسەر چاوەکانی گرتبوو، لە ئاسۆی دەڕوانی، لە تابلۆیەکی تردا قاپێکی پڕ لە ترێی یاقوتی بریقەدار سەرنجتی رادەکێشا. کۆتری سەر درەختی قەراخ جادەکە چاوی بڕیبووە شەقامەکە و چاوەڕێبوو تۆ بڕۆیت و چەشەی بکات، چوویتە دووکانەکەوە و سەیری دار و دیواریت دەکرد، پەردەیەکی گەورە لە بەرامبەرت بوو، کە ئاوێکی زولاڵی بەهێواشی لێوە دەڕۆی، لە تاشەبەردێک دوور دەکەوتەوە و بەڕێی خۆیدا دەڕۆیی، پەیکەری فەرهاد لەسەر ئەو تاشەبەردە مابووەوە، دەنگی سیسرک لە دوورەدەست دەهات، بێگومان لەوێ کەیفیان لە بۆنی تۆپیو دەهات.

ئیرۆمیان لە ناوەڕاستی دووکانەکەدا لەسەر ستاندێک پشت بەتابلۆی شیرین و فەرهاد بەدیار تابلۆیەکی ترەوە چەنەی دەدا، دایکی لە سووچێکی دووکانەکەدا لەسەر کورسییەکی بچووک دانیشتبوو، بەدەمووچاوێکی چرچ و لۆچ و قژە سپییەکەیەوە کە لەهەردوو لای لەچکەکەیەوە هاتبووە دەرێ، بەخاوی خەریکی ملپێچ چنینبوو، هەمان ملپێچی ئەرخەوانی کە ساڵەهای ساڵ پێیەوە خەریک بوو، دەیچنی و هەڵی دەوەشاندەوە و شلیلەکەی گلۆڵە دەکردەوە و دیسانەوە دەیچنییەوە. هەزاران جار ئەو ملپێچەی چنیبوو، دیسان هەڵی وەشاندبووەوە. ئێستا لەودیو شووشەی ئەستووری چاویلکەکەیەوە سەیری تۆ دەکات.

"سڵاو"

ئیرۆمیان سەیرکی کرد "دووبارە هاتیتەوە؟"

"ئەرێ"

"هەواڵت نییە.. دەزانی کە .. "

"رۆژگارم خۆش نین"

"رۆژگاری ئێمەش خۆش نییە.. بازاڕ نییە"

"من لە برسا دێمە دەرەوە.. سەیرێکی حاڵم بکە، من حاڵم باش نییە"

"باشە.. مەکێشە"

چەند هەنگاوێک لێی چوویتە پێشێ و لە بەرامبەریدا وەستایت "ناتوانم.. ئەگەر نەکێشم دەمرم"

"بەجەهەنەم"

"ئیتر ئەم قسانە بەسەرچوون، بەلای کەمەوە پۆترێتێ.. شتێک بدە بەمن تا بەم شێوەیە دەربەدەر نەبم"

"مەگەر خۆم دەستم نییە، پۆترێت بدەم بەتۆ بیکێشی؟!"

"ئاخر تۆ ئاگات لە حاڵی من نییە"

"ئاگام لێیە، یان دەکێشیت یان تەزریق دەکەیت.. بۆ تۆ وا دەزانی من لەسەر گەنجینەی قاروون دانیشتووم.. کەی کێشەی منە کە تۆ....."

عارەق لە ناوچەوانتەوە دەتکا و دەستەکانت دەلەرزی، وتت "کەواتە دیمەنی شتێک"

بەفڵچەکەی ئاماژەی بۆ تابلۆی شیرین و فەرهاد کرد و وتی "چەندێکە ئەوەت کێشاوە؟ کە کەس نەیەوێت.. خۆ من شێت نەبووم!.. پێم وتی شیرین بکێشە، تۆ چوویت ئەم فەرهادە مردووەت کێشاوە، ئەم

هەموو ئیشە نیوەناچڵە.."

بەتەنیشت تابلۆکەدا رۆیشتی، چاوێکت بەتاشەبەردەکەدا خشاند کە فەرهاد تەشوێکەی بەرز کرد بووەوە و بەسەر وێنەی سەر بەردەکەدا دای دەهێنایەوە، بەقژی ئاڵۆزاو، ئارام نوستبوو؟ دەنگی هۆڕینێکت بیست، گەڕایتەوە، پاسێکی شین لەخوار کێوەکەوە وەستا و کۆمەڵێک خوێندکار لێی دابەزین، کە هەموویان پێڵاوی وەرزشیان لە پێدابوو، دوایەمین کەسیان کچێکی لاواز و رەنگ پەڕیوو بوو کە بەدوو دارشەقی ژێر باڵییەوە لە پاسەکە دابەزی، ژنێکی تەمەن مامنامەندی بالابەرزیشیان لەگەڵدا بوو، ئینجا هەموویان وەک گرووپێکی کەڕ بەکۆرسێکی خۆش ئەم شیعرەیان وت «ئەمشەو دەنگی تەشوێ لە بێستوون نایەت.. رەنگە فەرهاد چووبێتە خەوی شیرینەوە.. رەنگە فەرهاد چووبێتە خەوی شیرینەوە..» دواتر هەموویان چەپڵەیان لێ دا.

تۆ خۆت خستە لاوە و لەسەر تەختەیەک لە بەردەم چایخانەیەکدا دانیشتی، چایچییەکە بێ ماتڵبوون چای بۆ هێنایت و سەیری رێبوارانی کرد، کە هەموویان لە دەوری ژنە بالابەرزەکە کۆ بووبوونەوە و گوێ قولاغ بوون بزانن چی دەڵێت، وتی "زۆر باشە.. ئەمەش بێستوون، ئەوەی لە پۆلدا وتم لە بیر خۆتانی بەرنەوە، لە "تاق بستان"یش بگەڕێن، نەخشی هەڵکۆڵدراوی سەر بەردەکانی تاق بستان بەفەرمانی "خەسرەو پەروێز" نەخشاوە، دوو بەشی ناوەوەی ئەشکەوتەکەتان ئاسایی لەیادە؟ نەخشەکانی دەرەوە؟ خەسرەو پەروێز سوار "شەبدیزی" ئەسپی خۆی بوو. لە دەستەڕاست نێچیرگەلێکی دیت، کە کۆمەڵێک دەیانویست راوی بکەن، بەلەمێک کە ژنانێکی مۆسیقار تێیدا بەجۆرەها ئامێر ئاوازی رۆژگاری نەخش و نیگاریان دەژەنی، لە دەستەچەپدا خەسرەو پەروێز

خەریکی راو بوو، بەڵام دواتر "قەتحعەلی شای قاجار" دەستووری دا نەخشی سەر بەردەکان دەستکاری بکەن و کردیان، نەخشی ئاغایان ئاخنییە ناو وێنەکەوە، یان بابڵێین خستیانە جێگەی خەسرەو پەروێزەوە ئەوی تری بەبێ دەستکاری وەک خۆی مایەوە، هەموو ئەمانە واز لێ بێن، ئێستا ئیتر ئێوە خۆتان بێستوون ببینن.. ئەمە تەنیا کێوێک نییە.. ئەمە پەیکەری فەرهادە.. لەسەر ئەم دیوارە لووسە بڕیاربوو کە نەخشی فەرهاد بکێشن، بەڵام نەخشی شیرین و فەرهاد تەنیا لە "فقرگاهی" مەهاباد ماوەتەوە».

دواتر رووەو ئەو کچەی بەدوو دارشەقەوە لە بەرامبەر کێوەکەدا وەستابوو وتی "تۆش لە چیرۆکەکەتدا فەرهاد مەکوژە، فەرهاد لە ئەدەبیاتی فارسیدا سیمایەکی هێجگار شیرینی هەیە.. هێجگار خۆشەویست.. سیمبولی عەشقە.. هەرگیز لە دەمی هیچ کەسێکەوە بەفەرهاد مەڵێ برۆ بمرە"

ژنە بالابەرزکە بەرووییەکی زۆر تامەزرۆوە، وەک ئەوەی بییەوێت هەموو ئەم کێوە لە چاوەکانیدا جێ بکاتەوە، چووە پێش و هەموویان بەدوایدا، بەڵام ئەو کچەی دارشەقەکانی پێ بوو دوادەکەوت، ئەوان چاوەڕێیان دەکرد تا دەیانگەیشتێ، دەڕۆشتن و ئەو دیسانەوە دوادەکەوتەوە، دەنگی لە عەرددانی دارشەقەکانی لێدانێکی لەسەر یەک بوو کە کێوەکەی دەلەراندەوە و زایەڵەکەی دەهاتەوە.

تۆ چا ساردەوەبووەکەت هەڵقوڕاند و پێش ئەوەی هەستی چایەکی تر خرایە بەردەمت، چایچییەکە وتی "نان دەخۆیت؟"

"نا"

"دوو هێلکەت بۆ بکەمە رۆنەوە"

تۆ هیچت نەگوت و سەیری خوێندکارەکانت دەکرد، گوێت لە دەنگی سروودیان بوو لە دوورەوە دەهات، دەتخواست پێیان بگەیتەوە، بەڵام نەتدەتوانی، چایچییەکە سینییەکی نایە پێشت، چەند لەتێک نان، سێ هێلکە، خوێدانێک و تەواو، چەند برسیت بوو! فەرموو لە دەمت دەکەوتە خوارێ، حەزم کرد منیش لەگەڵت بخۆم، زۆرم برسی بوو، بەڵام نەمتوانی.

هێواش هێواش نانەکەت خوارد، چات خواردەوە و جگەرەت کێشا، ئیتر خۆر ئاوا بووبوو، ترسێکی سەیر سێبەری خستبووە سەر هەوا، خوێندکارەکان هێشتا نەگەڕابوونەوە، بێدەنگی تێکەڵ بەترسی ئێرە دەبوو، هەوا وردەوردە سارد دەبوو، هەر چەند سیگارت دەکێشا نەتدەتوانی بەر بەلەرزت بگریت، چایچییەکەش لە چایخانەکەیدا گوێی لەڕادیۆ دەگرت و قاپ و پیاڵەکانی دەشۆرد، جار جارەش ئاوازی رادیۆکەی لە ژێر لێوەوە دەگوتەوە، دنیا بەتەواوی تاریک بوو، کەچی خوێندکارەکان نەگەڕانەوە، تۆ جگەرەیەکیترت پێکردوو روانیتە کێوەکە کەسەری کردبوو بەئاسماندا، ئەو کاتە لە ناو تاریکییەکەوە پیرێژنێک دەرکەوت کە ملپێچی ئەرخەوانی دەچنی، یان رەنگە خەریکبووبێت چنینەکەی هەڵوەشێنێتەوە، وەها پیرێژنێکت ساڵانێک پێشتر لە سەرمای وێرانکەری شارێکی دووردا دیبوو، بەدیار ئاگرێکەوە دانیشتبوو شلیلەی ئەرخەوانی لە شیشی چنینەکەیدا یان نا لە دەستە قایمەکانیدا ئەسیربوو، گلۆڵە شلیلەکەی لە گیرفانی چاکەتە کراوەکەی نابوو، هەروا دەیچنی و بەرەو لای تۆ دەهات، کاتێک بەتەواوی لە بەردەم رووناکی پەنجەرەی چایخانەکەدا وەستا، وتی "شیرین مرد"

پەنجەی دەستت لەخۆوە بۆ قژی سەرت رۆیشت و چنگت پێدا کرد،

من فرمێسکم لەسەر گۆنای تۆ لا پەسەند نییە، حەز دەکەم پێ بکەنیت، پیاو ناگری، ئایا چی دەبێت ئەگەر پیاوێک بگری، تۆ چەند ئازارت هەیە؟

چایچییەکە لەودیو پەنجەرەکەوە سەری دەرکێشا و هەروا کە سینییەکەی بەدەسماڵ دەسڕی وتی "لێی گەڕێ" بەپەنجەی ئاماژەی بۆ مێشکی کرد، تۆ سەرنجت نەدا، چایچییەکە هاتەدەرێ و لێت نزیک بووەوە، بەئەسپایی وتی "وازی لێ بێنە.. شێتە.. عەقڵی لەدەست داوە.. تێ دەگەیت؟"

لەپڕ دەرگەی دووکانەکە کرایەوە و پیاوێک کە دەستی منداڵێکی گرتبوو وتی "ئاغا.. پزیشکی دادوەری لە کوێیە؟"

ئیرۆمیان وتی "برۆ لە پێشترە"

تۆ بەئاشکرا دەلەرزیت و چنگت کردبوو بەقژتا، شتێک لە سنگتا پەلی دەکوتا کە بۆنی تەنیاییەکی منداڵانەی لێ دەهات، وتی "ئێستا من چی بکەم"

"هیچ.. برۆ بمرە"

"هەر ئەوەندە"

پیرێژن هەروا ملپێچە ئەرخەوانییەکەی دەچنی و ئیرۆمیان چاوی بچووک کردەوە و سەری خست بەدوادا، لە تابلۆی سەر ستاندەکەی دەڕوانی. ئیتر نەتزانی چۆن بۆ ماڵەوە گەڕایتەوە، تەواوی ڕێگەکەت چۆن بڕی، هیچت بیر نییە، چوویتە چێشتخانەکەوە، کەوانتەرەکەت کردەوە، خرتکە و پرتکەت هێنایە دەرێ، قەحبە وتی "بەدوای چیدا دەگەڕێیت؟"

کۆمەڵێک حەب و دەرمانی کۆن بێ ئەوەی سەیری ناو و بەروارەکەیان بکەیت خستتە دەست و گەڕایتەوە ژوورەکەت، وتی "دێیت پێکەوە قسە بکەین؟"

دەستت بەخێرایی راوەشاند تا سەعاتەکەت بچێتە سەر مەچەکت، کەچی سەعات لە دەستتا نەبوو، کەی بێ ئاگەداری من ئەوی فرۆشتبوو؟ چراکەت کوژاندەوە و لە بەرامبەریدا دانیشتی، ئەو لەسەر چرپاکە و تۆ لەسەر عەرد، ئێستا ئیتر چڵکی جێگەکە دیار نەبوو، چەند تاڵە رووناکییەک کە لای پەردەکەوە دەڕژایە سەردیوارەکە، پەڕ و باڵی کردبووەوە، بەڵام نەک وەک هەڵۆ. وەکو دیواری بەرزی قەڵای شارێکی کۆن، کە قەڵا و شوراکان پشت بەپشتی یەک، هەتاویان بەسەر دەستەوە دەبرد، وەکو چەپکێک رووناکی و سێبەر، کە سەریان کێشاوەتە گەردوون، تا گەردەکان بۆ پێ ماچکردن بگەیەننە عەرش.

جووڵەی بەدەن و نووری چاوەکانی تۆ بەرەبەرە کەم دەبووەوە، وەک هەتاوێک کە ئارام ئارام لەسەر دیواری رۆژئاوای ئاسمان نوقم دەبێت، وەک کە شتییەکیی جەنگی زەبەلاح کە نەرم نەرم لە کۆتاییی دەریادا ئاوا دەبێت، سات بەسات بێ هەستتر و خاڵیتر دەبیت، بەڵام ئەو نازانێت لە شێتییەکی کتوپڕدایت، خڕکەیەک حەپت لە بەردەمتدا داناوە، ئەو هەموو حەپە رەنگاوڕەنگت بەجارێک لە مشت ناوەوە بەپەرداخێک ئاوەوە قووتی دەدەیت، دەبینی رەنگت پەڕیوە و هەستت دەکرد دنیا بەسەرسەرتا دەخولێتەوە، وەک ئاگردانێک تۆ پێیەوە پێوەست بوویت، شتێک لەسەرتەوە پزیسکی دەهاوی.

وتی "خراپ کەوتمە داوت.. بۆ هەر پیاوێک دەبوو بەجۆرێک بچەمێمەوە، بەڵام بۆ تۆ بەهەموو شێوەیەک، ئاخر من جگە لە تۆ کەسی

تر شک نابەم، هەر بەڵایەک کە من دەمەوێت بەسەر پیاودا بیهێنم، هەر ئارەزوویەکم لە پیاوان هەبێت، هەر فکرێک لە بابەتی پیاوەوە دەکەوێتە گیانم، هەمووی کۆ دەکەمەوە و لە یەک شوێن.. بەڕاست تۆ حاڵت باش نییە؟!"

جگەرەکەی کردە تەپڵەکەکەوە و سەری لە تۆ نزیک کردەوە، دووکەڵی جگەرەکەی کرد بەدەموچاوتدا و دووچاری پەشێوی و لەرزینی کردیت، هەناسەیەکی قووڵت هەڵکێشا و داتەوە، هێڵنجت هات و رشایتەوە، نوزەیەکی لێوەهات و لەشوێنی خۆی هەستا "دەک بمرم.. حاڵی تۆ باش نییە"

دڵت تیواڵ تیواڵ دەبوو، دەستەکانت دەلەرزین و هیچ هەستێک لە قاچەکانتدا نەبوو، لێفەکەی بەخێرایی لەسەرت راکێشا و جل و دەست و دەمتی پاک کردەوە، لە بەردەمتدا کەوتبووە سەر ئەژنۆ و نەیدەزانی چی بکات، رەنگە قسە بکات، رەنگە بەقوربان و بەساقەت ببێت، رەنگە جوێن بدات، بەڵام تۆ نەتدەبیست، بەلاچاو ئەوت دی لەودیو دیوارێکی دووکەڵاوییەوە دەستەیەک حەبی فڕێ دا و لە ماڵ رای کردە دەرێ.

بەدەم مردنەوە پێکەنیت، بەو خەیاڵەی کە ئیتر ئاسوودە دەبیت، بۆ دوایەمین جار سەیری وێنەکەی منت کرد، تەواوی هێزی پاشەکەوتی خۆتت خستە گەڕ، تاببینیت چاوەکانم لە چ حاڵێکدان، بۆ ئەمە بەزەینتا هاتبوو؟ ئایا ئاماژەیەکی خۆکوشتنت لەودا دەبینی؟ لە هەمان ساتدا ئەوت دی کە بەدوو پیاوی کەتەوە گەڕابووەوە ماڵەوە، یەکیان قاچت و ئەوی تریان ژێر باڵت، بەرزیان کردیتەوە و ئیتر هیچت تێ نەگەیشت، چەندە زەمەن رۆشتبوو، رۆژێک، ساڵێک، نا، رێک بیست و چوار رۆژ تۆ کەوتبووی، شتێکت لە نەخۆشخانە بیر نایەت، جگە لە بۆکس و

پیاکێشانێ کە دوکتۆر و پەرستارەکان تێیان دەسرەواندی، جوێنیان پێ دەدایت "خوێڕی، ناتەواو، گەناڵ، لاشەخۆر، بۆگەن، بۆگەن، بۆگەن، بۆگەن"

بیست و چوار رۆژ تێپەڕی و ئەو وەک پەروانە بەدەورتا هەڵدەفڕی، جێگەی دەگۆڕیت، خواردنی لێ دەنا، گسکی دەدا، دەیشۆردیت، لەخوار هەمان تەختی تۆوە دەنووست، هەڵدەستا و دیسانەوە قسەی دەکرد، جارجار لە ماڵ دەڕۆییە دەرێ و پاش چەند سەعاتێک دەگەڕایەوە، تۆ کە بێ ئازار و ئارام لە نێو جێگەدا نوستبووی ئەو ماچی دەکردی، وازی دەهێنا ئاوها سەریری من بکەیت، دەزانی مەسخەرەترین شتی دنیا رووی دابوو؟ تۆ نەمردبوویت، بەڵام نەشدەژیای، تەنیا زیندووبووی، بونیامێک کە تەنیا دەبیستێت، بەگران قسە دەکات، پێ دەکەنێت، دەگری، بەڵام ئەسڵەن ناتوانێت بەپێوە بوەستێت، ناتوانێت قەڵەم بەدەستەوە بگرێت، تەنیا لەبەرئەوە هەیە تا بڵێن من هێشتا نەمردووم.

بەداخم.

سوپی لێ دەنا، بەریەخەی بۆ دەبەستیت، کەوچک کەوچک خواردن دەکات بەدەمتەوە و جارجاریش دەست دێنێت بەقژتا، بەخەندەیەکی نەرم بەتەواوی روخساریەوە، بەنیگایەکی میهرەبان، تەراشی بۆ دەکردی، لەگەنی دەهێنا و بەئاوی شلەتێن سەر و ملی بۆ دەشۆردی، دیسان قسەی دەکردەوە، رۆژێک کە خەریکبوو نینۆکەکانی بۆ دەکردی وتی "دێیت پێکەوە زەماوەند بکەین؟"

"ئا"

هەمان رۆژ مەلای هێنایە ماڵەکە و بەفەرمی بووە ژنی تۆ، دوای ئەوەی ژیانی تۆ گۆڕا، ئیتر هیچت لەدەست نەدەهات، تەواوی رۆژت

لەسەر چرپا دەگوزەراند. دەخەوتیت هەڵدەستایت، جێگەکەت تەڕ دەکرد و لە تەڕی بەردەوامی جێگەکەت بێزار بوویت. هەندێک کات کە ئەو قەحپەیە سەرخۆش دەبوو، پەرداخێک مەشروبی دەدایە دەستت و لەلایەکی چرپاکە دادەنیشت و دەیگوت "ئۆخەیش.. سەرەنجام بووی بەموڵکی من"

شەوێک خەوت بینی کە دەتوانیت بەڕێدا بڕۆیت، قاچەکانت لە ژێر دەسەڵاتتدا بوو، لە کۆڵانێکەوە پێچت دەکردەوە بۆ شەقامێک کە کۆمەڵێک خەڵکی جەنازە بەشان ڕێیان لێ گرتی، بۆ هەر لایەک بڕۆشتیتایە ئەوان پێشیان لێ دەگرتی، نەیان دەهێشت دەرچیت، هەرچەندە ئەملاولات دەکرد بێ سوود بوو، ئەوەندە هەوڵت دا شەکەت بوویت، شەلالی عارەق بووی و لەسەرخۆچوویت، لە ناوەڕاستی کۆڵانەکەدا وەستایت و لە نیوە خەو و نیوە بێداریدا هەستت کرد کە ئەوان جەنازەکەیان خستە سەر شانی تۆ، لاشەیەکی گەرم کە پارچەیەک قوماشی سەوزی تێوە پێچرا بوو، گەنجێکی پانزە ساڵ، هەستت کرد گەرمی کەوتە سەر ناوچەوانت، وادەهاتە پێش چاو ئەوەی کە لەو پارچە سەوزە پێچراوە نەمردووە، گەرم و زیندووە، ڕەنگە تای لێ هاتبێت، جەماعەت بەیەک دەنگ دەیانوت لا اله الا الله، جەنازەکەیان خستە سەر شانت و دووبارە بەرزیان کردەوە، ئیتر ترست شکابوو، پێکەنیت، چاوەکانت هەڵگڵۆفت و سەیرت کرد پیرەمێردێک ناوچەوانت ماچ دەکات، قەحبەکە وتی "تات لێ هاتووە.. ئازیزم.. بەڵام هیچ نییە"

پارچەیەکی لە لەگەنێکدا شۆرد، چۆڕاندییەوە، قەدی کرد و دیسانەوە خستییەوە سەر ناوچەوانت "تۆ وەکو مناڵ وایت، ئەگەرچی حەزم دەکرد لە تۆ منداڵێکم ببێت، بەڵام کە نەبوو، ئیتر خۆت وەکو منداڵێک بەخێو

دەکـەم.. بەهەمـوو ئەوانە رازیم، دەزانی من لە شـوێنێکی جەنجـاڵەوە هاتوومـەتە ئەم شـوێنە بێدەنگە.. یانزە خـوشک و برابـووین، یەک لەیەک بەدبەخـتتر، لە ژوورێکی رووتـەڵدا دەژیایین کە هـەمیشـە بۆنی نەوتی لێ دەهات، بۆنی نـەوت و میـز.. چوزانم. باوکم حـەسـحـەسـێکی تەڵەکـەباز بوو، شەوان بەسـەرخۆشی دەهاتەوە و ئەوەندەی نەڕەنەڕ دەکرد کە ئێمە لەترساندا لە ناو پێخەفەکانماندا دەمیزاین، دوایی هەرکەس نەیزانی لە کوێ گوم و گوڕبوو وەکو هـیتلەر، خۆی مرد؟ کوشتیان؟ ئێمە هیچمان نەزانـی و هـەر بەو جـۆرە گـەورەبـووین، دە سـالآن بـووم کـە بەقـاڵێکی نێرەکەر منی دەربردە پشتی دووکانەکەیەوە و دەستی بۆ دەبردم، درۆم کرد کـە پێم گـوتی تۆ چاو و گوێت کـردوومـەتەوە، تـۆ زۆر باشی.. بەلآم حەیف، حەزم دەکرد جوانترین کوڕی دنیات بۆ بخەمەوە.

من باش نیم، هیچ کاتێک باش نەبووم، لە دە ساڵییەوە هەموو شتێک تێ دەگـەیشـتم، دەچوومـە پشـتی ئەو دووکـانە نەفـرەتییـەوە و کـاڵەکم دەخوارد، سێوم دەخوارد، میوەهایەکم دەخوارد کە حەزم لێیان بوو، ئەو نێـرەکـەرە دەسـتی بـۆ دەبردم، تا رۆژێک دەسـتم کـرد بەگـیرفـانیـدا و رەسـمی ژنێکم تێدا بینییەوە، من لە منداڵییـەوە حەسـوود بووم، ویستم بزانم ئـەو ژنە کــێــیــە، بـەلآم ئەو نـەیدەویست بەمن بڵـێ، دوایی زانیم ژنێتی، سـەیرم کرد مـانەوەم لەوێ سـوودێکی نەمـابوو، لەگـەڵ لۆرییـەکی بارهـەڵگردا رۆشـتم بۆ باشـوور و لە بەردەسـتی ئەم شـۆفـێـر و ئەو شـۆفێردا گـەڕام، مـاوەیەک لە "سـەلەفـچگان" سـەرگـەردان بووم رێم ون کردبوو نەمدەزانی بۆ کوێ بچم.

ماوەیەک لە هەڵدێرێکدا مامەوە، بەفر بوو، خەریکبوو لە سەرمادا رەق ببینەوە، لە بەیانییـەوە هەتا ئێـوارە عارەقی جوولەکـەمان خـواردەوە،

لەوانەی کە دەست ئاسمانیش نەدەکەوت، پیاڵەکانمان پڕ کردبوو تا هاتین بیخۆینەوە نیوەی تێدا نەبوو، وتم "زوو بیخۆنەوە تا پەریان نەیان خواردووەتەوە" پەریان لەخۆوە لە سەرمای دەورووبەردا دەخولانەوە، ئێمە ئەوانمان نەدەدی، کاتێک پیاڵەمان خاڵی کرد، زانیمان رێگە کراوەتەوە و ئێمەش رۆشتین، ماوەیەکی زۆر لە باشوور بووم، سەمای بەندەریش فێر بووم، بێچاووڕووبووم، دەمپیس بووم، دەمویست هەر لە ڕوو پۆرتی پیاوان بشکێنم، بەڵام هیچ کاتێک نەمتوانی.

خۆم دەڕازاندەوە، دڵم دەبرد، یەکێک دەبوو بەتۆڕەکەمەوە و لەگەڵیدا دەڕیشتم، ژەهرم بۆ دەڕژاند کەچی بێ سوود بوو، رۆژان و سالان تێپەڕین و من گەورەتر بووم، ئەو رۆژانە هەموو شتێک وەک یەک بوون.. لێگەڕێن.. تا لە نۆزدە ساڵیدا هەر لەم تارانە چوومە سەر کارێک، لە عیادەی دکتۆرێکی مووبۆردا ئیشم دەکرد، کە هەمیشە بەقژییەوە خۆی دەخلافاند، ئەوەندە عارەقی دەکردەوە کە ناچار بوو بەدەستماڵێکی سپی عارەقی ناوچەوانی بسرێت، هەمان ئەو دکتۆرەی لەخوتوخۆڕایی مرد، دواتر تۆم بینی، خوا بەنەفرەتت بکات.

بەنووکی پەنجەکانم دەمکێشا بەدەسکی کورسییەدارەکەدا و هەوڵم دەدا هاوئاواز بێت لەگەڵ دەنگی چەرخە ئاسنەکانی شەمەنەفەرەکەدا، جووڵەی دەستم خێراتر کرد، خێرایی شەمەنەفەرەکە زۆر بوو... خێراتر... خێراتر... خێراتر.

ئەوەندە بەم کارە بێ مانایە درێژەم دایە کە سەرم گێژی خوارد و پەنجەکانم ئیتر لە ژێر دەسەلاتمدا نەمابوون، جووڵەکەم هێواش هێواش کردەوە و دەستم بەهێواشی لەسەر دەسکی کورسییەکە دانا، شەمەنەفەر وەستا، چاوەکانم نوقاند، یان رەنگە چاوە نوقاوەکانم

کردبێتـەوە، بیرم نییە، تـەنیا بیرمـە لە وێستگەیەکی شینی تەماویدا دەڕۆشتم و بەدوای کەسێکدا دەگەڕام، کەسێک دەهات یان کە سێک دەڕۆشت؟ نازانم بەدوای کێدا دەگەڕام، بەهەرکەسێک بگەیشتمایە بەدیقەتێکی تەواوەوە لێم دەڕوانی و هیچ کەسێک ئەو نەبوو، بەهەر لایەکدا دەڕۆشتم پەشیمان دەبوومەوە کە بۆ بەلاکەی تردا نەڕۆیشتووم، سەیری هەر کەسێکم دەکرد، ئەفسووسم دەخوارد کە بۆ سەیری ئەوانی ترم نەکردووە. ئەوان بالایەکی سەیر و نامۆیان هەبوو، وەک ئەوەی پێڵوی چاوەکانیان هەڵگەڕابێتەوە، سووریی ناو پێڵوەکانیان وەک "تەراخوما" ترسناکی دەکردن، من بەدوای کەسێکدا دەگەڕام کە پێڵوی چاوی هەڵنەگەڕابێتەوە. هەموویان دەچوون بەیەکدا، گومەزەکانی شین بوون، دەنگی فیغانی چەند ژنێک لەلایەکەوە دەگەییە گوێ، لە پیرەمێردێکی قەمبوور کە سەری بردبووە ناو عەباکەیەوە پرسیم "بۆ ئەم بونیامانە بەم شێوەیەن؟" وتی "ئەمانە هەموویان گوناهبارن.. گوناهێکیان کردووە بۆیە چاویان هەڵگەڕاوەتەوە "وتم "چ گوناهێ؟" کە سەری بەرز کردەوە بینیم پێڵوی ئەویش هەڵگەڕاوەتەوە و خوێنێکی رەش لە چەناگەیەوە دڵۆپ دڵۆپ دەتکێت، لە ترسا قریشکاندم، بەڵام دەنگ لە قوڕگمەوە دەرنەهات، دەنگدانەوەی هاوارەکەم لە کەللەمدا دەسوڕایەوە، چەند کەسێک لە سەرما دەستیان بەڕاکردنکرد و من هێڵنجم دەهات وەک ئەوەی شتێک دڵۆپ دڵۆپ لە زەینمەوە بڕژێ، دیوارەکانی کاسە سەرم درزیان دەبرد، دەستەکانم بەهەردوو لای سەرمەوە گرت و پاڵم دا بەکورسییەکەوە، دەنگی شەمەنەفەرەکە ئیتر بەردەوام نەدەهات، وەک لە باوە پێچرابێت گاهێ دەهات و گاهێ نەدەهات.

قەحبە وتی "ماوەیەک گرم گرتبوو، ئێستاش هەروام، رۆژێک

سەردەکەم بەشوێنێکدا و دەڕۆم، ئەوکاتە دەبینی کە ئیتر نیم کەچی خەیاڵ دەکەیت هەم، دەزانی ئەگەر باوکم سەرخۆش نەبایە و لاقەی نەکردمایە رەنگە هێجگار وا دەرنەچوومایە"

"زینا لەگەڵ مەحەرەمەکانی خۆی؟!"

"ئۆف.. ئا.. ئا.. ئا"

دەنگی خەمگین و کوژەربوو، دوو سێ مژی قووڵی لە جگەرەکەی دا و وتی "تاکەت دابەزیوە ئێستا "ئەستامینوفن"ێکت دەدەمێ کە ئاسان بنویت.. ئەدی.. ئازیزم"

حاڵت باش نەبوو، کەسێک لە چاوێکی نائاگاوە بەشەلاق کەوتبووە گیانی تۆ و هەر لێی دەدای، عەجەب چ دنیایەکی بۆگەنە! پیاوێک دڵی دۆڕاندبووە ژنێکی قەشەنگ تەنیا لەبەرئەوەی یەک تابلۆی هونەری لە سیمای، ئەندامی، پەنجەی باریک و ئەو نیگا ئاگراوییەی بکێشێت. بەڵام بێ هیوا بوو وەک من، کە بەدوای ئەم چاوانەدا هاتم، لە ژێر داروپەردووی جەستەی خۆیدا مابووەوە، تەرمی مەعشوقەکەی بەسەر شانەوە بوو نەیدەزانی بۆ کوێ بچێت، تا بەرەبەیان دەنگی گریانەکەشم لە پشت ئەو هەموو ساڵەوە دەبیست، دەمبیست کە پیاوێکی شەست ساڵە دوای نیوەشەوێکی تاریک لە تەنیاییدا دەگریا و هیچ پەنایەکی نەبوو، ئەو پیاوە تۆ توویت، بەڵام من لە کوێ بووم؟

چاوت بڕییە وێنەکەی من کە رەنگە هەستم و لە کەنارتدا ئارام بگرم، یان ئارام بگری، سەربخەینە سەرشانی یەکتر و فرمێسک هەڵڕێژین، بەدوو دەستی شل و شۆڕ و ماندوێتییەکی خەوهێنەرەوە، کە پاش ئەو هەموو هیلاکییە دێنە سۆراخی مرۆڤ، بۆ تۆ پەنا بهێنم. لەکاتێکدا توند

باوەشت پێدا کردووم و گەرمایی لەشی خۆتم پێ دەبەخشیت، گاهێ بەدوو پەنجە لە نێوان دەستەکاندا نەوازشم بکەیت و پەراسووەکانم بژمێریت، تا بزانیت کامەیاکەیان کەمە و گاهێ کە دێتەوە هۆش خۆت بەئارامی بەبەری دەستت بە پشتمدا بکێشیت، بێ ئەوە قسەیەک بکەیت، یان بەزەینتدا ختورە بکات کە من بۆ دەگریم و چ مەرگمە؟ بێ ئەوەی بپرسی من کێم و لە کوێوە هاتووم و بۆ هێندە دڵەتەپەمە و بەگومانم، وەک چۆلەکەیەکی خوساوی ژێر باران؟

نا ئیتر نەمدەویست.

کە چاوت کردەوە، قەحبەکە پێکەنی و پەرداخێک چای لە بەردەمتدا دانا.. سەربەندەکەی لە دواوە گرێ دابوو. خێرا خێرا فلچەکانتی دەشکاند و دەیکردە سەتلێکەوە و رەنگە وشکبووەکانی دەکردە کیسەیەکی خۆڵەوە، چوارچێوە تەواونەبووەکانی بەپەتێکی ناسک بەیەکەوە بەست و گەنجێکی کەتە کیسەکانی لە قادرمەکە بردە خوارێ و لەودیو دەرگەکەوە بەجێی هێشت. ویستت راست بیتەوە، نەتتوانی، قەحبەکە هاتە هاوکاریت، گۆشەیەکی خستە ژێر سەرت تا بتوانی چاکەت بخۆیتەوە.

وتی "ئیسراحەتمان کرد.. وا نییە؟"

چووە چێشتخانەکەوە و هاتە دەرێ، دیسانەوە کیسەیەکی پڕ پاشماوە رەنگ و قەڵەم و قەڵەمدان کە لەوێ مابووەوە هێنایە دەرێ، وتی "سبەینێ ماڵەکێشەکان دێن.. دەمەوێت دار و دیواری ماڵەکەمان ساف بکەین.. رەنگێکی پەمەیی کاڵی بکەین، کارەباچی بهێنم چەند گڵۆپێکی رەنگاورەنگ راکێشم.. دواتر چەرچییەکان بێن ئەم هەزارپیشەیە فڕێ بدەنە دەرەوە، تۆش هەر لەبەر ئەم خرتکە و پرتکەیەیە دڵت گیراوە، بەڵام

وا دەزانی نەخۆشیت. ئێرە بەپەردەی مەنگۆلەدار دەکەم بەدوو بەشەوە تا چاوت بەسەرو بیچمی هێلکەفرۆش و ئەوانە نەکەوێت کە پێیان دەڵێیت غەریبە"

دوو جگەرەی پێ کرد و دانەیەکیانی دایە دەست تۆ، وتی "دەگریت؟ خۆ من شتێکی خراپم نەوتووە، باوەڕ بکە هەرچیم کردووە و هەرچیم وتووە لەبەر تۆ بووە، بۆ کێ ئەم هەمــوو رەنگەت رژاند بەســـەر ئەو تابلۆیانەدا؟ بۆ ناوبانگی دوای مردن؟ مردووشۆر.. دەمەوێت ژیانێکی نوێ دەست پێ بکەم، کارێک دەکەم کە بمانکاتەوە بەتۆپ"

دەستی خستبووە قژتەوە و لە ڕووی تواناوە تێکەڵەیەک لە سۆزێکی دایکانە و لاواندنەوەی یەکەمین ژنی جیهان بۆ ئاژەڵێکی ماڵی، بەردەوام بوو "ئاخ ئەگەر سەرت لەو کونە دەهێنایە دەرێ و دەتزانی کە دنیا بەدەست چ کەسانێکەوە دەگەڕێت.. ڕۆژێک دەتبەمە تەنیشت پەنجەرەکە و نیشانت دەدەم؛ وێرانەکانی دەوروبەر گۆڕاون بۆ تەلاری گەورە گەورە، سەتەلایت بەردەوام بەرنامەی خۆش پەخش دەکات، ئیتر مرۆڤەکان نامە بۆ یەکتر نانووسن، فاکس دەکەن. لەم کاتەدا تۆ دادەنیشی رەنگ دەڕێژیت بەسەر تابلۆدا! باوەڕ بکە ئەوەی کە دەیلێم قسەی بەتاڵ نییە، ڕاستییەکی روونە، بەدوو ساڵ ئێرە دەکەم بەکۆشک، تەلارێکی جوان.. ئیتر من کار ناکەم، پۆلێک کچی ناساک دەخەمە ئیشەوە، ئەو کاتە رەنگە خۆشم جارێکی تر ببمەوە بەسۆزانی.. چوزانم"

چاوی بڕییە سوچێک و لە خەیاڵاتی خۆیدا ون بوو، تۆ سەیری وێنەی منت دەکرد و نووکی پەنجە شادەت دەکرۆژت، حەزت لە جگەرە بوو، لە چا، لە بیستنی فیکەی سەرخۆشێک لە نیوەشەوێکی باراناویدا، مەیلی کانادای سارد، نازانم ئەوکاتە بیری باوکیشت دەکەوتەوە؟

وتی "ئەم هەزارپیشەیە زۆر جێ دەگرێت، فرێی دەدەمە دەرەوە و دەرۆم دیکۆرسازێک رادەسپێرم کە دیکۆرێکم بۆ بکات، هەر بریقەکەی چاوی مشتەری کوێر بکات.. دەبینی ئازیزم کە تەواوی تەمەنت هەڵەت کردبوو.. بیرتە بەقایشێک تێم دەکەوتی و شین و مۆرت دەکردمەوە؟ دەتویست لە من مۆدیلێکی کەڕ و کوێر دروست بکەیت، بۆ؟ کە ببم بە پەیکەرێک! لەبەر چی، چی لە سەرتا بوو؟ بەڕاست بیرتە؟"

بیرتە من دەربەدەر بەدوای ئەودا دەگەڕام و هیچ شوێن پێیەکیم چنگ نەدەکەوت؟ ئیتر نەدەچووە قاوەخانەکان، هیچ شەقامێک بۆنی ئەوی لێ نەدەهات، هیچ کەسێک شێوەی ئەو نەبوون.. من هەر بەدوایدا دەگەڕام، سەرەنجام شەوێکی بەهار دڵم سپاردە دەریاوە و هەموو قاوەخانەکان یەک یەک گەڕام، قاوەخانەی فیردەوسیی، قاوەخانەی نادری، قاوەخانەی لوقانتە، هەموو شوێنێک قەرەباڵغ بوو، بونیامەکان دەچوون بەیەکدا و بۆ من، هیچ کەسێک ئەو نەبوو. چوومە بارێک بەنێوتوانج و پەنجە راکێشان و قسەی ناخۆشدا تێ پەڕیم، دوو پێک عاراقی فەلم خواردەوە و هاتمە دەرێ، چوومە قاوەخانەی فیردەوسیی، قاوەیەکم بانگ کرد، بەقادرمەکاندا چوومە خوارێ بێ ئەوەی بیرم بێت دەرگەکە دابخەم، سرنجم لە جانتاکەم دەرهێنا و پڕم کرد و چەقاندمە دەمارمەوە، کە تەواو بوو هەندێک خوێنم دەرهێنا و دیسانەوە تێم کردەوە، دەرم کێشا و تێم کردەوە، سەیری خۆمم لە ئاوێنەدا کرد، چەند تێکشکاو و پیربووم! لە دەنگی ئۆکۆردیۆنی کابرا نابیناکەی بەردەرگەوە زانیم باران بەخوڕ دەبارێت، گەرمام بوو، بەقادرمەکاندا سەرکەوتمەوە و بەسەرپێوە قاوەکەم هەڵدا، ئەسکە ناسێکم کردە ژێر پیاڵەکە و هاتمە دەرێ، دەستم کرد بەجانتاکەمدا، چەند ئەسکەناسێکم لە تاریکیدا

دەرهێنا و خستمە گیرفانی ئەو مۆسیقارەوە و لەگەڵ دەنگی ئۆکۆردۆنەکەیدا هاوئاواز دەمگوتەوە "ئەی ڕۆژگاری نەخش و نیگاران.. هەرچی بوو خەون بوو.. خەیاڵ بوو.. ئەی دڵی نووستوو.. ئەی خەوی شیرین"

باران بەخوڕ دەبارێت، وەک ئەوەی ئاسمان تەڕم بکات. خۆم ڕەها کرد بە تاریکایی شەو و بارانی بەخوڕ کە دەیشۆردمەوە و مەستتری دەکردم، هەموو مەستییەکانم بەخۆشی ئەوە، من بەخۆشی ئەوەوە دەمخواردەوە. بەشەقامی فیردەوسیدا هەڵگەڕام و بەشەقامەکەی ئەودا پێچم کردەوە، لە بەردەم ماڵەکەیدا وەک سەربازێکی ئێشکگر دەهاتم و دەچووم، لە تەنیشت ژوورەکەیەوە چەندین جار هاتم و چووم و زانیم کە نییە، چرای ژوورەکەی خامۆش بوو، بۆنی قاوەی چاکەت و پانتۆڵەکەی لە هەوای باراناویدا حاڵی بەحاڵم دەکرد، ئەگەر بهاتایە و منی لەوێدا ببینیبا دەیگوت "مەگەر تۆ ئاوکێشی نهێنییەکانی خەڵکیت؟"

میلی پەنجەرەی ژوورەکەیم بەهەردوو دەست گرت و سەرم بەشێلمان و خشتی ماڵەکەیەوە نابوو، وتم ئەی ڕۆژگاری نەخش و نیگاران، ئێمە خوامان دەوێت، ئێمە ون بووی بێ بەلەمەکان، ئێمە منالانی قوتابییەکانی سەربەڕێ، ئێمە کوڵەفڕی خوساوەین لە داسی جووتیار دەترسین، ئێمە گوناهێکمان نەکردووە، بێ پەنا ماوین، دەغڵ و دان لێ دوراو، لانە تێکچوو، مالانی ئاوەدانی سێ نهۆمی.

بێچارە دڵم. باران خوڕ خوڕ دەبارێ و من سەرمامە، من سەرمامە و هیچ کەسێک نییە، هیچ وەلامێک نییە، ژوورەکە بۆنی مەرگی لێ دەهات، بۆنی جەستەیەکی ئاوساوی ناوچەمەدانییەک بەکوڵی ژنێکەوە، ئەو ژنە من بووم. نازانم بۆ تۆم بیر کەوتەوە، هەوای تۆ کەوتبووە سەرم،

دەمویست سەرێکت لێ بدەم، میلی پەنجەرەکەم بەردا، دووبارە لە بەرامبەر ئەو ماڵە کۆنە هاتم و چووم، دەنگی هاوئاوازی منداڵانی بچووکم بیست، سەیرێکی سەر دەرگەکەم کرد، ئەو هەموو نەخش و نیگارەی سەر ئەو کاشییە شینە دێرینانە! چ حاڵێکم هەبوو؟ هیچ تێ ناگەم، دەنگی باران لە نێو چەرخی شەمەنەفەرەکەدا ون دەبوو. لەپڕ ماشینێک لە دوامەوە وەستا، پیاوێک جامەکەی دادایەوە و وتی "دەتوانین ئەمشەو لە خزمەتدا بین؟"

پشتم لەرزی، ئاوڕێکم دایەوە لە تاریک و روونـدا سەیرم کرد چەند کەس بوون؟ نەمدەزانی.

وتم "من؟"

وتی "ئا تۆ.. قەحبەی هەرزە"

وتم "من.. خۆ نیم"

وتی "بێ دایک و باوک"و ویستی لە ماشینەکە دابەزێت کە من رام کرد، کۆڵانە و کۆڵان، باشە ئاسک لە دەشتدا چۆن دەتوانێت رابکات و هێڵێکی غوبار لە دوای خۆی جێ بهێڵێ؟ قژم لە هەوادا پەرێشان دەبوو، مەمکەکانم بەدوو دەست گرتبوو تا نەکەوێت، دەنگی هەنکەهانکیانم دەبیست و رام دەکرد. بۆ ساتێک سەرم خستە ناو دەستەکانمەوە و خۆم راوەشاند، ویستم وێنەی زەینم بگۆڕێ، ویستم بۆ رۆژگاری نەخش و نیگاران بگەڕێمەوە، ویستم لە شەمەنەفەرێکدا دانیشتم و بەرەوشوێنێکی نەزانراو لە تاریکی بێ کۆتایی ئەو تونێلە دووکەڵ گرتوو یان ئاسمان رەشەدا، تەرمێک بەکۆڵمەوە بێت و بەلام کەس لە من نەپرسێ بۆ هەم.

لە شەمەنەفەرەکەدا بووم؟ لەسەر چرپاکە نووستبووم؟ هیچم لە یاد نییە، تەنیا ئەوەم لە یادە کە دوو مۆم لە مۆمدانێکدا بەلای سەرمەوە دەسووتان و ئەو بەتاسەیەکی سەیرەوە چاوی بڕیبووە من، من مردبووم و ئەو مەراسیمی زیندووکردنەوە "ژیاندنەوە"ی منی بەجێ دەهێنا، بەدەورمدا باڵەفڕەی دەکرد، من دەنگی هەناسەی لەرزیویم دەبیست، شلەیەکی تفت و شیرینم لە دەممدا هەست پێ دەکرد، کە بەنێوان ددانە داخراوەکانمەوە بۆ گەرووم سەرەوخواردەبوو، وەک قورقوشمێکی تواوە کە ئاگری لە گیانم بەردەدا. لە ڕەحمی دایکێکەوە پێم دەخستە دنیاوە، دنیایەک کە لە یەکەمین ساتەوە دەبوو سازی گریانم کۆک بکردایە و بەتەواوی وجودمەوە لە ناخی دڵمەوە شینم بکردایە.

هەستم کرد شەمەنەفەرەکە لە تاریکی تونێلەکە دەچێتە دەرێ، ڕووناکییەکی کەم لە دوورەوە دیاربوو، دەنگی چەرخەکانی شەمەنەفەرەکە هێواش.. هێواش دەبڕاو وەکو لەنگەری سەعاتێکی پوکاوە دەجوڵا و ئەو چەرخانەی دەهاڕی، ئایا بەیان ئەنگوتبوو، ئایا ئەوە هەتاوبوو کە ڕووناکی ڕشتبووە ناو چاوە ماندووەکانی من؟ بۆ ساتێک کرژبووم و هەڵلەرزیم، ساردی کێردێکم لە لەشمدا هەست پێ کرد، شتێکی بڕی کە من قیژاندم و بۆ یەکەمین جار دەنگی قیژەی خۆمم بیست، وەک ئەوەی پۆلێک ڕاوچی پەتێکی گەورە لە دەریادا گرێ بدەن، بەڵام شەپۆلی خێرا وەک مقەستێکی دەسکرەش پەتەکەی دەبڕی، تۆڕ و ماسییەکان دەگەڕانەوە بۆ دەریا. بەزەحمەت لە نێوان پێڵووەکانمەوە چەمەدانییە قاوەییەکەم بەژوور سەرمەوە بینی و بۆنێکی بێزارکەری لە سەرما هەڵکرد، بۆنی دەریایەک بوو کە هەموو ماسییەکان مردبوون، کوڕە گەورەی پاشا شای ماسییەکانی ڕاو کردبوو و ماسییەکان

هەمـــوویان مـــردبوون، دەریا بۆنی مـــردارەوبووی لێ دەهات، بۆنێکی نەفرەت ئەنگێز کە ڕێی هەناسەمی دادەخست.

ئەوکاتە شەپۆلێکی خێرا لە جەستەمەوە هەڵکشا و هەموو ئەو بۆنە بێزارەی داشۆرد و هەموو شتەکانی لە بیر بردمەوە، دەنگگەلێکی نوێ هات، هەندێک پێ دەکـــەنین و هەندێک چەپڵـــەیان لێ دەدا، ژنێک دەینالاند، ئایا ئەو ژنە من بووم؟

"کچە؟"

کەسێک چەمەدانییەکەی لەلای سەرمەوە هەڵدەگرت و ڕای کرد و دوور دەکەوتەوە، ئایا ئیتر تەرمێک بەکۆڵمەوە نەبوو؟ دەستم بۆ یەخەمبرد لای مەمکەکانم گەڕام، هیچ کلیلێک نەبوو، سەگەکان لە دوورەدەست حەپەحەپیان دەکرد و پیرەمێردێکی قەمبوور لە قەراغ جۆگە ئاوێک، لە ژێر دار سەرووەکدا، پەنجەی حیرەتی بردبوو بۆ دەمی و لە ژێر چاوەوە چاوەڕوانی دەکێشا، تا گوڵی نیلۆفەر بچنم و پێشکێشی بکەم.

ئەمە خەمگین نییە؟

کۆتایی

# لە نیگارکێشەوە بۆ نیگار

## دیالۆگ و دانووستانی دوو دەق

عەتا نەهایی

وتووێژ و دیالۆگی نێوان مرۆڤەکان، بەتایبەت مرۆڤی بیرمەند و داهێنەر، دوو ئاست و ئاراستەی هاوزەمەنی و ناوزەمەنی، یان هەنووکەیی و مێژوویی هەیە. بەو مانایە کە مرۆڤی بیرمەند و داهێنەر وێڕای وتووێژ لەگەڵ هاوسەردەمەکانی، بەردەوام لە حاڵی دیالۆگ لەگەڵ مرۆڤی سەردەمانی رابوردوو، تەنانەت داهاتووشە. ئەو بەردەوام خەریکی وڵامدانەوە بە پرسیارەکانی پێشینان و گەلاڵەکردنی پرسیار بۆ نەوەکانی داهاتووە. پێشکەوتن و پەرەسەندن لە هەموو بوارە فکری و ئەدەبی و هونەرییەکاندا بەرئەنجامی ئەم پرسیار و وەڵامە بێپسانەوە و ئەم دانووستان و دیالۆگە نەقرتاوەیە. لە هەموو بوارەکان و بە تایبەت لە بواری داهێنانی ئەدەبیدا دەقەکان مەیدانی ئەم دانووستانەن، یان بە واتایەکی تر، ئەم دانووستان و دیالۆگە لە دەقەکاندا خۆی دەردەخات. ئەوەی دەقێکی سەرکەوتوو لە دەقێکی تێکشکاو یان زڕەدەق جیا دەکاتەوە سەردەمیانە بوون و لە هەمان کاتیشدا دەستەویەخە بوون یان "چالنج" لەگەڵ باشترین دەقەکانی بەر لە خۆیەتی. هەڵەیەکی گەورەیە کە ئەم دەستەویەخە بوون و چالنجە بە دابڕان و پشت هەڵکردنی دەقێک لە دەقەکانی رابوردوو بزاندرێت. «کارێک کە زڕەدەقە بەناو ئاوانگاردەکان دەیکەن». لەوەش هەڵەتر ئەوەیە کە دەقەکان لە هەموو بارێکەوە یەکتر دووبارە بکەنەوە.

لێرەوە دەچمە سەر بابەتی نووسینەکە کە خوێندنەوەیەکی بەراورد

کارانەی ڕۆمانی پەیکەری فەرهاد، بە قەڵەمی "عەباس مەعرووفی" نووسەری ئێرانییە. بەر لە هەموو نرخاندنێکی پێشوەخت، عەباس مەعرووفی لەو نووسەرانەیە کە بەردەوام لە حاڵی وتووێژ و دانووستانی ڕۆشنبیری و ئەدەبی لەگەڵ نووسەرانی بەر لە خۆیەتی و، بەرهەمە داستانییەکانی لە دەوامەی لۆجیکیی چیرۆک و ڕۆمانی ئێرانیدایە. لەم میانەدا ڕۆمانی پەیکەری فەرهاد نموونەی دیاری بەرهەمێکی داستانییە کە ڕاستەوخۆ لە هەناوی بەرهەمێکی ترەوە سەری هەڵداوە و لەسەر زەمینەی واقیعێکی داستانییەوە هاتووەتە بوون. ئەم ڕۆمانە دەقێکە نەوەک هەر لە پێوەندی و دانووستان لەگەڵ دەقێکی تری داستانی، بەڵکو دەقێکە کە نمایشی ئەم پێوەندی و دانووستانە دەکات. ئەم ڕۆمانە ڕەوایەتیکی ئاڵۆزی زهنییە لە زمانی کەسایەتییەک کە لە ڕۆمانێکی ترەوە هاتووە.

ڕاوی یان بێژەری ڕۆمانی پەیکەری فەرهاد، لە ڕاستیدا کەسایەتی ڕۆمانی "کوندە کوێرە"، بە ناوبانگترین ڕۆمانی سادق هیدایەت و لە هەمان کاتیشدا بە ناوبانگترین ڕۆمانی فارسییە کە زیاتر لە حەفتا ساڵ بەر لە ئێستا و شەست ساڵ بەر لە نووسینی پەیکەری فەرهاد نووسراوە. من گومانم لەوە نییە کە هەموو کەسایەتییە چیرۆکییەکان «تەنانەت کەسایەتی فانتاستیکترین چیرۆک و ڕۆمانەکانیش» پێیان لە ناو دنیای واقیعدایە و، بە شێوەیەک لە دنیای واقیعەوە دەچنە ناو دنیای مەجازی چیرۆک و ڕۆمانەکان. ئەوەش دەزانم کە گوێزانەوەی کەسایەتی لە چیرۆک و ڕۆمانێکەوە بۆ چیرۆک و ڕۆمانێکی تر بابەتێکی تازە و غەریب نییە و، لەخۆیدا بەها بە بەرهەم نابەخشێت یان لە بەهاکانی کەم ناکاتەوە. ئەوەی لەم ڕۆمانەدا بەلای منەوە سەرنج ڕاکێش و جێی ڕامان و تێفکرینە ئەوەیە کە مەعرووفی لەم ڕۆمانەیدا

ئیمکانی گوتن و گێڕانەوە بە کەسایەتییەک دەبەخشێت کە لە ڕۆمانەکەی پێشوو، واتە لە ڕۆمانی کوندە کوێرەدا هیچ دەرفەت و مەجالێکی بۆ گوتن و گێڕانەوە پێ نەدراوە. نووسەر، خۆی لە دوو لاپەڕەی کۆتاییی کتێبەکەیدا پاش ئەوە کە باسی چۆنیەتی نووسینی ئەو ڕۆمانەی دەکات دەڵێ: «بە پێچەوانەی نووسینەکانی پێشووم بۆ خۆم دەورێکی ئەوتۆم لە نووسینی ئەم ڕۆمانەدا نەبوو. کاتێک دەستم بە نووسین کرد، وەک ئەسپێکی وەحشی هەوساری پساند و ڕووی لە کێو و بیابان کرد. ژنی قەڵەمدانەکەی کوندە کوێرە دەیگێڕایەوە و من واسیتە بووم تا ئەم شێوازە غەریزییە دوور لە عەقڵە خۆی دەربخات.» پاشان دەڵێت: «ئەزموونی ئیقاع و زمانی کوندە کوێرە و، گەڕان بە ناو نیگاری قەڵەمدانەکاندا شێتییەک بوو. شێتییەک کە هێور هێور ڕوحمی دەجوو. ژنی ڕۆمانی کوندە کوێرە دەستی بە گوتن کردبوو، لە خەو و بێداریدا وازی لێ نەدەهێنام... من هیچ گەڵاڵە و پلاتێکم بۆ چیرۆکەکە نەبوو، نەمدەزانی ڕووداوەکان بەرەو کوێ دەڕۆن.»

دیارە پێویست ناکات گومان لەم گوتەی نووسەر بکەین، چونکە شێوازی گێڕانەوەکە ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەخات کە نووسەر هیچ گەڵاڵە و پلاتێکی لەوە پێش داڕژاوی بۆ نووسینی ڕۆمانەکەی نەبووە. ژنی ڕۆمانی کوندە کوێرە، یان وا باشترە بگوترێت، نیگاری سەر بەرگی قەڵەمدانەکان کە ئێمە پێشتر لە زمانی ڕاوی و بێژەری ئەو ڕۆمانەوە لە گەڵ هۆویەت و کارەکتەرەکەی، یان با بڵێم لەگەڵ بێهۆویەتی و بێ کارەکتەرییدا ئاشنا بووین، پاش شەست ساڵ لە ڕۆمانەکەی عەباس مەعرووفیدا دەردەکەوێتەوە و، ئەم جارە لە زمان و ڕوانگەی خۆیەوە، چیرۆکی ژیان و سەربوردەی خۆی دەگێڕێتەوە.

لەبەرئەوە کە یەکێک لە مەبەستە سەرەکییەکانی ئەم کورتە خوێندنەوەیە گرینگیدان بە پێوەندی نێوانی دەقی ئەم ڕۆمانە و ڕۆمانی کوندە کوێرەی سادقی هیدایەت و، چۆنیەتی دیالۆگ و دانووستانی فەرهەنگی و ئەدەبی نێوان ئەم دوو نووسەرەیە، ناچارم ئاوڕێکی زۆر کورت و راگوزاری لەو ڕۆمانەش بدەمەوە و سووکە بەراوردێکیش لە نێوان هەندێک لایەنی ئەم دوو دەقە بکەم.

کوندە کوێرەی سادق هیدایەت گێڕانەوەی دوو چیرۆک یان دوو ڕەهەندی چیرۆکێکی ئاڵۆز و قووڵ و کراوەیە. گێڕانەوەیەکی زهنییە کە سنوورەکانی نێوان خەون و بەئاگایی، واقیع و خەیاڵی شێواندووە. کوندە کوێرە چیرۆکێکی عاشقانەیە کە لە زمانی پیاوێکی تەنیا و خەمۆک و مالیخولیاییەوە، لە دوو بەشی سەرەکیدا دەگێڕدرێتەوە. راوی یان بێژەری ئەم ڕۆمانە ئەگەرچی ناوی نییە، بەڵام تا ئێستا و پاش حەفتا ساڵ، هێشتا بەناوبانگترین کەسایەتی چیرۆک بە زمانی فارسییە، زۆربەی هەرە زۆری خوێنەوارانی پیر و گەنجی ئێرانی دەیناسن و یەکەم پاراگرافی گێڕانەوەکەیان لەبەرە: «لە ژیاندا زامگەلێک هەیە کە وەک خۆرە، بە هێوری و لە تەریکیدا روح دەخوات و دەیتاشێت. ناکرێ لەلای کەس باسی ئەم زام و ئازارانە بکەیت، چونکە هەموو کەس بە پێی عادەت ئەم ئازارە بڕوا پێنەکراوە بە ڕووداو و پێشهاتی سەیر و دەگمەن دەزانێ، ئەگەر کەسێک بیڵێت یان بینووسێت خەڵک بە پێی بۆچوونی باو و بۆچوونی خویان هەوڵ دەدەن بە بزەیەکی پڕ لە گومان و گاڵتەجاڕی وەری بگرن. چما مرۆڤ هێشتا چارە و دەرمانێکی بۆ ئەم زام و ئازارانە نەدیوەتەوە و تاکە هەتوانیش فەرامۆشی بە شەراب و خەوی تلیاک و مادەی سڕکەرە.»

ئەم ئازارە کە بێژەری ڕۆمانی کوندە کوێرە لە دەسپێکی

گێـڕانەوەکـەیدا بەم شـێـوە باسـی دەکـات، بەرئەنجـامـی عـەشـقـێکی ماخۆلیانە. ئەو لە دەوامەی گێڕانەوەکەیدا باسی ئەوە دەکات کە چۆن لە درزی تاقی ژوورەکەی، لە پشت کووپەیەک شەرابی کۆنی حەوت ساڵەوە چاوی بە دیمەنێک دەکـەوێت کـە لەو دیمـەنەدا کـچـێکی جـوان بەسـەر شیوەڵێکدا نەویوەتەوە و، گوڵێکی نیلوفەڕ پێشکێش بە پیاوێکی کووڕی ئەوبەر شـیـوەڵەکـە دەکـات. بێگومـان ئەم دیمەنە سـەدان سـاڵە کـە بۆ هەمـوو ئـێـرانیـیـەک و، تەنانەت بۆ زۆربـەی خـەڵکی ئەم ناوچـەیەش دیمەنێکی ئاشنایە. دیمەنێکی مینیاتۆڕی کە لەسەر هەموو شتێک، هەر لە کاسـە و دەورییەوە بگرە تا بەرگی قـەڵەمدانەکان کێشراوەتەوە. راوی یان بێژەری گێڕانەوەکە شـەیدای ئەو کـچـە نیلوفـەڕ بە دەسـتـە دەبێت و لێی دەبێـتـە ژنی خـەون و خـۆزگـە دوور و درێژەکـانی و، وەک مـرۆڤـێکی خـەیاڵی و فریشـتـەیەکی ئاسـمـانی باسـی دەکات. فـریشـتـەیەک کـە دواتر دێتـە ژوورەکـەی و بێ هیچ قـسـە و گفـتـوگۆیەک لـەسـەر قـەرەوێڵـەکـەی رادەکشێت و هـەر لەوێش دەمرێت. ئەوسا کابرا کە لە هەموو هـەوڵێک بۆ ژیاندنەوەی نائومێد دەبێت، لە ئەنجـامـدا بۆ ئەوەی دەست و چاوی هیچ پیـاوێکی تر سـیـمـای بان زەوینی ئـەو دڵدارە فـریشـتـە ئـاسـایە نەشـەمزێنێت، جـەسـتـەی ناسکی لەت و کوت و پارچە پارچە دەکـات و لە ژێر خـاکدا دەیشـارێتـەوە. پاشـان تا هـەتا هـەتایە لە فـیـراقی دوو چاوی رەشی ئەو دڵدارە خـەیاڵ کـردە، خـۆی بە کـێـشـانەوە نیگاری ئەو ژنە لەسـەر بەرگی قـەڵەمـدانەکـان خـەریک دەکـات. ئەمـە کـورتـەی بەشی یەکەمی رۆمانـەکەیە کـە بێژەر بە خـەو دەیبینێت و دوا ئـەوە کە بەئاگـای دەبێـتـەوە، لـە بەشی دووەمـدا بڕیاری نووسـینەوەی ئـەو خـەونە دەدات. بەڵام ئەوەی کـە بێژەر لە بەشی دووەمـدا دەینووسـێت روویەکی تری ئەو خـەونـە، یان ئەو چیـرۆکـەیە. گـێڕانەوەی بەشـی دووەمی رۆمـانی کـوندە

کوێره، دیسان خەونێکی تر، بەڵام ئەم جاره خەونێکی گەلێک ناخۆش و کابووسێکی گەلێک ترسناکە. لەم بەشەدا راوی یان بێژەر چیرۆکی شەیدایی خۆی بۆ ژنێک دەنووسێت کە بە پێچەوانەی ژنە فریشتە ئاساکەی بەشی یەکەم، نەوەک ژنی خەون و خەیالات، بەڵکو ژنی خویەتی. ژنێکی سۆزانی و لەیلەدۆنەیەکی دەرپێ بە کۆڵ کە بێژەر لە ئەنجامدا ئەویش دەکوژێت.

من نامەوێ لەم نووسینەدا رۆمانی کونده کوێره بخوێنمەوە کە لەوپەڕی ئاڵۆزی و فرەڕەهەندی و قووڵیدایە، بەڵکو دەمەوێ بڵێم ئەو ژنە فریشتە ئاسا و مینیاتۆرییە کە خوێنەر تەنیا لە زهن و زمانی بێژەری پیاوی چیرۆکەکەوە لەگەڵی ئاشنا دەبێت، ئەو ژنە کە لەو رۆمانەدا فرسەتی گوتنی تاکە وشەیەکیشی نەبووە و، لە پاش مردنیشی ئەسیری سەر بەرگی قەڵەمدانەکان بووە، لە پاش شەست ساڵ و لە پاش سەفەرێکی دووردرێژ بە سەر بەرگی قەڵەمدانەکانەوە، لە رۆمانی پەیکەری فەرهاددا دەردەکەوێتەوە و، ئەم جارەیان خۆی بڕیاری گێڕانەوەی ژیان و سەربوردەکانی ژیانی خۆی دەدات. ئەگەر لە رۆمانی کونده کوێرەدا بێژەری پیاو نیگار کێشی سەربەرگی قەڵەمدانەکان چیرۆکەکەی بۆ سێبەری خۆی دەگێڕێتەوە، لە رۆمانی پەیکەری فەرهاددا بێژەری ژن نیگاری سەر بەرگی قەڵەمدانەکان چیرۆکەکە بۆ پیاوێکی نەقاش کەسێکی وەک بێژەری رۆمانەکەی پێشوو دەگێڕێتەوە. پیاوێک کە لە ناخ و دەروونی خۆیدا شەیدای ئەو ژنە فریشتە ئاسایە یان ئەو نیگارە مینیاتۆرییەیە، بەڵام تووشی بە تووشی ژنێکی هەرزە و بەرەڵاوە بووە. کەواتە بە رواڵەت هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆ لە مابەینی چیرۆکی ئەم دوو رۆمانە نییە، جگە لەوە کە لە رۆمانی کونده کوێرەدا رووداوەکە لە روانگەی زهن و زمانی نەقاش و نیگارکێشەوە

گـێـڕدراوەتەوە، بـەڵام لە ڕۆمـانی پەیکەری فـەرهاددا ڕووداوەکـان لە ڕوانگەی زهن و زمـانی نەقش و نیگارەکەوە دەگێڕدرێنەوە. ئەڵبـەت ئەمە تەنیا جیاوازی نێوان ئەم دوو ڕۆمانە نییە. گرینگترین خاڵی جیاوازی نێوان ئەم دوو ڕۆمانە لایەنی سـەمبـولیک و هێمـاییـنی هەمـوو توخم و ڕەگەزەکانی ڕۆمانی کوندە کوێرە و پێوەندی ئەم توخم و ڕەگەزانە لەگەڵ قـووڵتـرین لایەنـەکـانی زهنی مـرۆڤ، بە تایبـەت زهنی ڕاوی و بێـژەری گێڕانەوەکەیە. کوندە کوێرە خەونێکە کە هەمـوو کون و کەلەبەرەکانی ناوشیار "ناخـودئاگای" زهنی مرۆڤ، لەسەر بەستێنی میـژوو، فەرهەنگ و زمـانی ئێرانـی، نمایش دەکات. ئەمـە قـووڵاییـیـەکی وەهای بەم دەقـە کراوەیە بەخشـیوە کە تا ئێسـتا سـەدان وتار و دەیان کـتێبی بە زمـانی فـارسـی و تەنانەت زمـانە ڕۆژاواییـیـەکـانیـش لەسـەر نووسـراوە و، بە هەموو جۆرە مەنهەجێکی ئەدەبی "زمانناسی، کۆمەڵناسی، دەروونناسی و..." خوێندراوەتەوە.

بێگومـان پەیکەری فـەرهادیش گێـڕانەوەیەکی سـەرکەوتـوو، ئاڵۆز و چێژبەخشـە، بەڵام ئەم ڕۆمانە لەگەڵ ئەوەشدا کە گێڕانەوەیەکی زهنییە، زیاتر لـەوە کە ئـاوڕی لە دەروون و ناوشـیـاری زهنی مـرۆڤ دابێـتـەوە، داڵغەی نواندنەوەی کێشە و گرفتە کۆمـەڵایەتییەکان و، بەتایبەت کێشە و گرفتـەکانی ژن لە کۆمـەڵگەی پیاوسـالاری هەیە. ئەوەندە کە ڕۆمـانی کوندە کوێرە سـەروکاری لەگەڵ هێمـا و سـەمبـولەکانە و دەیهـەوێت بە بۆنـەی ئەوانەوە پەردە لەسـەر بوونی مـرۆڤ و ڕازە دەروونیـیـەکـانی هـەڵبـداتـەوە، پەیکەری فـەرهـاد بە خـەمی کـێـشـە و گـرفـتـە کۆمەڵایەتییەکانەوەیە و دەخوازێت ڕەگوریشەی مێژوویی ئەو کێشە و گرفتانە شی بکاتەوە. بۆیە ئەگەر لە ڕۆمـانی کوندە کوێرەدا بە گوتەی "ڕێنە لانو"ی فـەرانسـەیی «گـرینگی هونەر بە مـانـای ئەوپەڕی

شەرەفمەندیی وشەکە، لە بەرچاوی خوێنەر بە شێوەیەکی ئاشکرا دەردەکەوێت.» ڕۆمانی پەیکەری فەرهاد بە گوتەی "ڕۆلف ئێشپنلەر" ڕەخنەنووسی گۆڤاری "تاگ ئشپیگڵ"ی ئاڵمانی «دەنگ و جەستە و سۆز و پلەوپایەی ژن بۆ ژن دەگەڕێنێتەوە.»

ئەگەر شێوازی گێڕانەوەی ڕۆمانی کوندە کوێرە بازنەییە و، ڕاوی یان بێژەر لە شوێنێکەوە دەست بەگێڕانەوە دەکات و لەسەر ڕەوتێکی بازنەیی دەگاتەوە بۆ هەمان شوێن و هەمدیس لەوێوە دەست پێ دەکاتەوە و وەک هەڵگەڕان بە پەیژە یان پێپلیکانێکی خڕ و بازنەیی بەرەو ژوور هەڵدەکشێت، ڕۆمانی پەیکەری فەرهاد تاکبێژییەکی دوور و درێژ و پچڕ پچڕی کەسایەتی سەرەکی چیرۆکەکە، واتە ژنی تابلۆی نەقاشی، یان نیگاری سەر بەرگی قەڵەمدانە. تاکبێژی ژنێک کە لە کەسنەزانی(*) زهنی ڕاوی و بێژەری ڕۆمانەکەی سادق هیدایەت دەرباز بووە و چووەتە خەونی پیاوێکی نیگارکێشی تر و لە خەونی ئەو پیاوە نیگارکێشەدا چیرۆکەکەی دەگێڕێتەوە. کەواتە دەبێ بڵێم پەیکەری فەرهاد ئەگەرچی بەرواڵەت تاکبێژییەکی دەروونی ژنە، بەڵام لە ناخی خۆیدا وتووێژی ژن و پیاوە. دیالۆگی نیگار و نیگارکێش. دانووستانی شاعی و سرووش، هونەرمەند و ئیلهام.

***

بێگومان لە خوێنەری ئەم چەند لاپەڕە شاراوە نییە کە هەموو پیاوێک، بە تایبەت پیاوانی هونەرمەند و داهێنەر، لە زهنی خۆیاندا سیمای لێڵی ژنێکی فریشتە ئاسای بان زەوینییان هەڵگرتووە. ژنێک کە سەرچاوەی ئیلهامی شاعیرانە و هونەرمەندانەیە. ژنێک کە بە درێژاییی مێژووی

(*) کەسنەزان = ناشوێن "ناکجا اباد"

ئەدەب و هونەر، هەر شاعیرێک بە شێوەیەک وەسف و مەدح و پەسنی کردووە و هەر نەقاشێک بە شێوەیەک نیگاری کێشاوەتەوە و هەر مۆسیقاژەن و دەنگبێژێک بە شێوەیەک بە گوێیدا چرپاندووە. پیاوانی هەست ناسک بە درێژاییی تەمەنیان "وشیارانە یان ناوشیارانە" بە شوێن ئەو ژنە ناسکە خەیاڵییەدا دەگەڕێن. ئەوان کاتێک عاشق دەبن پێیان وایە ژنی خەون و خەیاڵەکانیان بینیوەتەوە، بەڵام کاتێک بە دڵدارەکەیان دەگەن، ئەو وێنە زهنییە وردە وردە لە مێشکیاندا کاڵ دەبێتەوە و ئەو عەشقە ئەفلاتوونییە لەسەر قەرەوێڵە و لە ناو جێی خەوتنەکەیاندا دەمرێت. ئەوسا هێور هێور دڵدارەکەیان لێ دەبێتە ژنێکی ئاسایی و لە هەندێک حاڵەتی دەگمەنیشدا ژنێکی هەرزەی دەرپێ بەکۆڵ. چیرۆکی کوندە کوێرەی سادق هیدایەت لە رووکەشیترین لایەنیدا، نمایشی ئەم دۆخە دەکات. بێژەری پیاوی رۆمانەکە پاش مردنی ژنی فریشتە ئاسای خەیاڵەکانی لەسەر قەرەوێلەکەی و، پاش ئەوە کە دڵدارەکەی لێ دەبێتە ژنێکی هەرزەی دەرپێ بە کۆڵ، تووشی خەمۆکی و نائومێدییەکی کوشەندە و هونەرمەندانە دەبێت و پاشماوەی تەمەنی خۆی بە کێشانەوەی روخساری ژنی فریشتە ئاسای خەیاڵەکانیی، لەسەر بەرگی قەڵەمدانەکان، خەریک دەبێت. ئەم چیرۆکە لە پەیکەری فەرهادیشدا دووبارە دەبێتەوە. جیاوازییەکە لەوەدایە کە ئەمجارە نیگاری سەر بەرگی قەڵەمدان، یان با بڵێم ژنە ناسکە خەیاڵییەکەیە کە دەچێتە خەونی پیاوێکی نەقاش و بەمشێوە دەست بە گێڕانەوە دەکات:

«نازانم ، ئایا دەتوانم سەر بنێمە سەر شانەکانت و فرمێسک بڕێژم؟ بە دوو دەستی شۆڕ و داکەوتوو، سرِی خەوی پاش هیلاکییەکی زۆر کە هەڵدەکوتێتە سەر گیانی مرۆڤ، پەنات بۆ بهێنم؟ لە کاتێکدا توند لە

باوەشت گرتووم و گەرمای لەشی خۆتم پێ دەبەخشی، جارێک بە دوو قامکی ناوەڕاستی هەر دوو دەستت دەملاوێنیتەوە و پەراسووەکانم دەبژێریت تا بزانی کامیان یەکی کەمە و، جارێک کە وەخۆت دێیتەوە بەرە دەستت بە پشتمدا دەکێشیت، ئارام، بێ ئەوەی بپرسیت من کێم، لە کوێوە هاتووم و بۆ ئاوا دوودڵ و دڕدۆنگم، وەک چۆلەکەی تەڕی بەر باران؟...» پاشان بەمشێوە درێژەی پێ دەدا: «نا، ئیتر نەمدەتوانی دوای ئەو سەفەرە دوورودرێژانە، پاش ئەو هەموو ساڵە تەنیاییە و دووری لەو چاوە رەش و بە بریقانە کە بە نیگایەکی پشت دەلاقەی ماڵەکەی ژیانی بەئاگرەوە نام، ئیتر نەمدەتوانی سەرگەردان بم...»

ئەمە گوتنی نەقش و نیگارێکی بێ پرسپێکتیوە کە لە بێ هۆویەتی و بێ کاراکتەری خۆی وەرس بووە و، بەندی دەیان و بگرە سەدان ساڵەی سەر بەرگی قەڵەمدانەکانی پساندووە. ئەمە گوتنی ژنێکە کە هێڵی سووری بێدەنگیی لە مێژینەی بەزاندووە و چیرۆکێکمان بۆ دەگێڕێتەوە کە پێشتر نەمانبیستووە.

نەمانبیستووە؟

چیرۆکی پەیکەری فەرهاد گێڕانەوەیەکی ئاڵۆز و فرە رەهەندە، کە لە رەهەندێکیدا دووبارە بوونەوەی چیرۆکی کوندە کوێرەیە و، زۆربەی کەسایەتی و رووداوەکانی ئەو رۆمانەی تێیدا دەردەکەوێتەوە. پێشتر ئاماژەم بەوە کردووە کە رۆمانی کوندە کوێرە لە رواڵەتیترین و رووکەشیترین دەرکەوتنیدا چیرۆکێکی دوو پاڵوو، یان با بڵێم دوو چیرۆکە کە لە هەر کامەیاندا لایەنێک، یان سیمایەکی ژن لە روانگەی پیاوەوە دەردەکەوێت و دەگێڕدرێتەوە. ئەم دوو چیرۆکە، یان ئەم دوو پاڵووی چیرۆکەکە، لە رۆمانی پەیکەری فەرهاددا بەهەمان شێوە و ئەم

جاره له روانگه و له زمانی ژنەکەوە دووباره دەبێتەوە. لەم رۆمانەدا ژنەکە شەیدای وێنەی زهنی و بان زەوینی پیاو دەبێت. پیاوێک کە دەمرێت و ژنەکە پەیکەرەکەی دەخاتە جانتایەکەوە و بۆ هەمیشە بە کۆڵی خۆیدا دەدات و لەگەڵ خۆی دەیگێڕێت. لە لایەکی تریشەوە هەر ئەم ژنە دەچێتە خەونی پیاوێکی نەقاش کە لەگەڵ ژنێکی هەرزە و بەرەڵادا دەژی و ئازاری دەدات. تا ئێره رەنگە بگوترێت پەیکەری فەرهاد لاسایی و دووباره نووسینەوەی کونده کوێره، یان له باشترین حاڵەتدا خوێندنەوە و سادەکردنەوەی ئەو رۆمانەیە. رەنگە بگوترێت عەباس مەعرووفی نەک هەر کەسایەتی و رووداوەکان، بەڵکو زۆربەی تێم و موتیڤەکانیشی له رۆمانەکەی سادق هیدایەت وەرگرتووه و، بێجگە لەوەش، هەر له روانگەی هیدایەتەوە سەیری ژنی کردووه و، وەک ئەو ژنی له دوو سیمای دژوازی فریشتە ئاسا و هەرزەدا بینیوه. رەنگە بگوترێت مەعرووفی نەیتوانیوه وەها کە له سەرەتای ئەم نووسینەدا ئاماژەی پێ کرا وتووێژ و دیالۆگێکی رۆشنبیرانەی ئەدەبی لەگەڵ هیدایەت ساز بکات و، دەقەکەشی نەکەوتووەتە کێشە و چالنج لەگەڵ دەقەکەی هیدایەت. رەنگە بگوترێت پەیکەری فەرهاد نەک هەر هیچ وەڵامێکی ئەمرۆییانەی بە پرسیارەکانی کونده کوێره نەداوەتەوە، بەڵکو هیچ پرسیارێکی تازەشی بەرهەم نەهێناوه.

بێگومان ئەم بۆچوونە و ئەم نرخاندن و قەزاوەت کردنە، بۆچوون و نرخاندنێکی بە پەلە و یەک لایەنەیە. حاشا لەوە ناکرێت کە نیگا و روانینی نووسەری رۆمانی پەیکەری فەرهاد بۆ چەمکگەلێکی وەک ژن، عەشق، مەرگ و ژیان، بە شێوەیەک دووبارەکردنەوەی نیگا و روانینی سادق هیدایەت و رۆمانی کونده کوێرەیە. بەڵام خودی سادق هیدایەت و رۆمانەکەشی، لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم چەمکانە، له شاعیران و

داستانبێژانی کۆنی ئێرانی، لە کەسانێکی وەک "نزامی" و دەقە عاشقانەکانی وەک لەیلی و مەجنوون و شیرین و فەرهادی تێ نەپەڕاندووە.

عەباس مەعرووفی لە دوا لاپەڕەی کتێبەکەیدا دەڵێت: «هەستم دەکرد کە پێوەندییەکی قووڵ لە مابەینی هیدایەت و نزامیدا هەیە، بەڵام هەرچی بیرم دەکردەوە نەمدەتوانی پێناسەی ئەو پێوەندییە بکەم. هیدایەت چ پێوەندییەکی بە نزامییەوە بوو؟» ئەوەی کە مەعرووفی نەیتوانیوە پێناسەی بکات، بوونی فکرێکی هاوبەش و خوێندنەوەی چونیەکی هیدایەت و نزامی و زۆر شاعیر و داستانبێژی تر بۆ چەمکگەلێکی وەک ژن، عەشق، مەرگ و ژیانە. فکر و خوێندنەوەیەک کە لە رۆمانەکەی مەعرووفیشدا بە بێ هیچ گۆڕانێک دووبارە دەبێتەوە.

راستە دەقە ئەدەبییەکان مەیدانی دیالۆگ و دانووستانی رۆشنبیرانەی نێوان شاعیر یان نووسەر لەگەڵ شاعیر یان نووسەرانی ترە، بەڵام پێویست ناکات ئەم دیالۆگ و دانووستانە حەتمەن بە ئاراستەیەکی فکری و فەلسەفیدا بڕوات. رۆمانەکەی سادق هیدایەت لەگەڵ ئەوەدا کە نیگا و روانینێکی رۆژهەڵاتی و ئێرانی و بێگومان نەریتی بۆ ژن و عەشق و مەرگ و ژیان هەیە، بەڵام بە مۆدێرنترین شێوە نمایشی کاریگەری ئەم شێوە روانینە لەسەر هەست و هزر و سایکۆلۆجی مرۆڤ دەکات و بە مۆدێرنترین شێوە زاڵبوونی ئەم نیگایە و کاریگەری لەسەر وشیار و ناوشیاری زهنیی مرۆڤ دەگێڕێتەوە. هەروەها پەیکەری فەرهادیش کاریگەری ئەم شێوە روانینە رۆژهەڵاتی و نەریتییە بۆ ژن و عەشق و... لەسەر فەرهەنگ و مێژوو، رووداوە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکان دەگێڕێتەوە. ئەم دوو رۆمانە، وێڕای توانا و

بەهای هونەری و ئەدەبی جیاوازیان، لە راستیدا تەواوکەری یەکترن. یەکەمیان بە سەرسامکەرترین شێوە پەردە لەسەر نەدیوترین سووچەکانی ناخ و دەروونی پیاوی رۆژهەلاتی و ئێرانی هەلدەداتەوە و، دووەمیشیان ئامادەیی ژن لە رووداوە مێژوویی و کۆمەلیەتییەکانی ئەم هەرێمە دەنوێنێتەوە. راوی یان بێژەری ژنی رۆمانی پەیکەری فەرهاد، نیگاری سەرگەردانی سەر قەلەمدانەکانە کە لە رابوردووە هاتووە، لە خەیاڵ و واقیعی رابوردووەوە، لە ئەفسانە و مێژووەوە هاتووە. مەعرووفی نەک هەر لەم رۆمانەیدا بەلکو لە هەموو رۆمانەکانی تریشیدا چاوێکی لە ئەفسانە و چاوێکی تری لە مێژووی ولاتەکەیەتی. کەسایەتییەکانیشی هاوکات لە دلی ئەم دووانەوە سەرهەلدەدەن. رووداو و کارەساتەکانیش هاوکات لایەنێکی خەیالی و ئەفسانەیی و لایەنێکی تری واقیعی و مێژووییان هەیە.

راوی یان بێژەری پەیکەری فەرهاد، نیگاری ژنێکی گەنج و جوان کە دەیان و سەدان ساڵ ناچار کراوە کە لەسەر بەرگی قەلەمدانەکان روو لە پیرەپیاوێکی کوورِ و قەمبوور بکات و گولی نیلووفەرِی پێشکێش بکات، ئێستا نەک هەر بریاری هەلاتن و خۆدەربازکردن لە بەندی قەلەمدانەکانی داوە، بەلکو بە تەمایە لە بەندی پیرە کوورِ و قەمبورەکەش هەلبێت. لە بەندی هەموو ئەو پیاوانە هەلێت کە خۆی واتەنی «دەیانویست دامان پۆشن و بمانشارنەوە. یان هەولیان دەدا جلمان لەبەر دابدرِن. ئێمە "نیگاری سەر هەموو قەلەمدانەکان" فێر بووین کە هەلێین، بەلام بۆ کوێ؟ سنووری نێوان ئەم دووانە کوێ بوو؟ دەبوو لە کوێ بوەستاینایە کە نە ئەسیری بانگبێژان و جارِچیانی ئەخلاق بین و نە بە دەستی درِندە بێ ئەخلاقەکان پەرِ پەرِ بکرێین؟ من کە تا ئەو رۆژە هیچ کارێکم جگە لە بەنیگاربوونی بەردەوام لەسەر

قەڵەمدانەکان نەدەزانی، ئێستا فێر بووم کە لە پەردەی نەقاشی یان بەرگی قەلەمدانەکان بێمەدەر و لە کاری دنیا سەرم سوورِ بمێنێت. شوێن ئەو چاوانە بکەوم کە مانایان بە ژیانم بەخشیبوو»

لێرەوە ئیتر ئەم ژنە بە هەر دوو ڕێچکەی بەرهەست و نابەرهەست، ئەفسانەیی و مێژوویی‌دا سەر ڕێ دەکەوێت و لە پێناوی دۆزینەوەی دڵدارەکەی، نەقاشی سەر بەرگی قەڵەمدانەکان، خۆی بە خەونی نەقاشێکی تردا دەکات و لە خەونی ئەودا و لە گۆشە نیگای ژنانەی خۆیەوە، چیرۆکی ژیانی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوە.

لێرەوە دەبێ بڵێم هەروا کە شێوازی گێڕانەوەی بازنەیی ئەو دەرفەتەی بە هیدایەت بەخشیوە کە وەک چەرخە مەتەیەک بە ناخ و دەروونی خەونەکانی بێژەری ڕۆمانەکەیدا ڕۆ بچێت و، قووڵترین سووچی زهنییەتی هەڵبکۆڵێ و، پەردە لەسەر هێما و وێنە زهنی و ئەزەلی و ئەبەدییەکان هەڵبداتەوە، عەباس مەعرووفیش بە سوود وەرگرتن لە شێوازی تاکبێژی دەروونی ئەو هێما و وێنە زهنییانە دەهێنێتە گۆ و، لە زمانی ئەوانەوە واقیع و ڕووداو و کارەساتەکانی کۆمەڵگەیەک دەگێڕێتەوە کە هێشتا ئەو هێما و وێنە زهنییانە زۆرترین دەور و کاریگەرییان لەسەر ژیان و گوزەرانی هەیە. بێگومان من نامەوێ سەرلەنوێ بەو ڕووداو و کارەساتانەدا بچمەوە و دیسان بیانگێڕمەوە. بەڵکو دەمەوێ بڵێم ئەوەی کە راوی یان بێژەری ڕۆمانی پەیکەری فەرهاد بەوپەڕی وردبینی ژنانە و لە ریتمێکی توند و خێرادا دەیگێڕێتەوە، کۆی ئەو ڕووداو و کارەساتانە، کۆی ئەو کێشە و گرفتانەیە کە کۆمەڵگەی ئێرانی لە کۆنەوە تا ئێستا بەتایبەت ئێستا لەگەڵیدا ڕووبەڕوو بووەتەوە و بەدەستیانەوە دەناڵێنێت.

لەم چوارچێوەدا، یەکێک لە جوانییەکانی گێڕانەوەکەی عەباس مەعرووفی ئەوەیە کە لە لایەکەوە خەونەکانی راوی رۆمانی کوندە کوێرە و رۆمانەکەی خۆی "پەیکەری فەرهاد" تێ هەڵکێش دەکات، لە لایەکی ترەوە رووداوە واقیعییەکان و کێشە و گرفتە کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمی سادق هیدایەت بە رووداو و کێشە و گرفتە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەم سەردەمەوە گرێ دەدات. ئەو بەم کارە پێمان دەسەلمێنێت: هەروەها کە رۆمانەکەی و خەونی کەسایەتییەکانی رۆمانەکەی، لە هەناوی رۆمانەکەی هیدایەت و خەونی کەسایەتییەکانی هیدایەتەوە سەریان هەڵداوە، بە هەمان شێوە رووداو و کارەسات و کێشە و گرفتە فەرهەنگی و کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمەکەشی "ئەم سەردەمە" درێژ کراوەی رووداو و کێشە و گرفتەکانی سەردەمی هیدایەت و بەر لە ئەویشن.

بە دڵنیاییەوە تێ هەڵکێش بوون و لێکدرانی رووداو و کەسایەتی و تێم و موتیڤەکانی ئەم دوو رۆمانە لە ئاستێکدایە کە خوێنەری پەیکەری فەرهاد بە بێ خوێندنەوەی رۆمانی کوندەکوێرە ئیمکانی پێوەندی و چێژبردن و تێگەیشتن لە ماناکانی نییە. یان با بڵێم رێگەی نزیکبوونەوە و گەیشتن بە دنیای داستانی پەیکەری فەرهاد، لە دنیای داستانی کوندە کوێرەوە تێ دەپەڕێت. ئەگەرچی خودی مەعرووفی بۆچوونێکی جیاوازی هەیە و پێی وایە وێڕای ئەو هەموو نزیکایەتییەش، رۆمانی پەیکەری فەرهاد بەرهەمێکی سەر بەخۆ و لەخۆیدا تەواوە و، بەبێ ئاگەداری خوێنەر لە رۆمانەکەی سادق هیدایەت و بەبێ خوێندنەوەی ئەو رۆمانەش ماناکانی خۆی بەدەستەوە دەدات و چێژ بەخوێنەرانی دەگەیەنێت.

بێگومان مەعرووفیش وەک هەموو ئەو خوێنەرانە کە رۆمانی کوندە

کوێرەیان خوێندووەتەوە و لەگەڵیدا ژیاون، ناتوانێت بۆ ساتێکیش کەسایەتی و رووداو و تێم و موتیڤەکانی ئەو رۆمانە فەرامۆش بکات و، لە روانگەی کەسێکەوە کە ئەو رۆمانەی نەخوێندووەتەوە قەزاوەت لەسەر سەربەخۆیی و ناسەربەخۆیی رۆمانی پەیکەری فەرهاد بکات. من پێم وایە رۆمانەکەی سادق هیدایەت بە هەموو رەهەندەکانییەوە وەها تەندراوەتە رۆمانی پەیکەری فەرهاد کە هیچ خوێنەرێکی بێ ئاگا لەو رۆمانە ناتوانێت پێوەندیی قایمی لەگەڵ بگرێت و، چێژی پێویستی لێ وەربگرێت. من لەگەڵ ئەوەدا کە پێم وایە هیچ چیرۆک یان رۆمانێکی سەربەخۆ نابێت بۆ بە دەستەوەدانی هەموو مانا و جوانییەکانی داوا لە خوێنەر بکات ئاوڕ لە دەرەوەی خۆی، واتە مێژوو یان رووداوە کۆمەڵایەتییەکان یان دەقێکی تر بداتەوە. بەڵام پێم وایە رۆمانی پەیکەری فەرهاد بێ ئەو سەربەخۆییە تەواوەش رۆمانێکی سەرکەوتووە. چونکە ئەگەرچی ئەم رۆمانە وەک هەموو دەقێکی ئەدەبی و داهێنەرانەی تر لە دیالۆگ و دانووستان لەگەڵ دەقەکانی تردایە، لە هەمان کاتیشدا نمایشی ئەم دیالۆگ و دانووستانە دەکات. ئەم نمایشکردنە بابەتێکی جیاوازە و تایبەت بەم رۆمانەیە. ئێمە دەزانین کە نمایش و نواندنەوەی هەموو دیالۆگ و دانووستانێک پێویستی بە ئامادەیی هەردوو لایەنی دانووستانەکەیە. من نامەوێ پاساو بۆ هیچ یان بۆ کەس بهێنمەوە. خۆشحاڵم بەرلەوە کە پەیکەری فەرهاد بکرێت بە کوردی رۆمانی کوندە کوێرە کراوە بە کوردی و، خۆشحاڵتریش دەبم ئەگەر پەیکەری فەرهاد خوێنەرەکانی ناچار بە خوێندنەوەی رۆمانەکەی سادق هیدایەت بکات.

بابەتێکی تر کە دەمەوێ لەم خوێندنەوە کورتەدا ئاماژەی پێ بکەم بابەتی زمانە. بە دڵنیاییەوە زمانی گێڕانەوەی پەیکەری فەرهاد لایەنی

هەرە بەهێز و سەرکەوتووی ڕۆمانەکەیە. مەعرووفی لە هەمان لاپەڕەی کۆتاییی کتێبەکەدا دەڵێ «ئەزموونی لەحنی "ئیقاع" کوندە کوێرە و گەڕان لە نەقاشی قەڵەمدانەکان شێتییەک بوو...» من گومانم لەو شێتییە داهێنەرانە نییە، بەڵام ئەگەر مەبەستی نووسەر ئەوە بێت کە زمان و لەحنی ڕۆمانەکەی هەمان زمان و لەحنی کوندە کوێرەیە، پێم وابێت بە هەڵەدا چووە.

ئەوە راستە کە لە مێژووی ئەدەبی هاوچەرخی فارسیدا زمان و لەحنی داستانی کوندە کوێرە دەور و کاریگەرییەکی حاشا هەڵنەگری لە گۆڕان و تازەکردنەوەی پەخشان و نەسری نقیساری فارسی هەبووە و، بەشێکی زۆری لە توانا و قابلییەتەکانی ئەم زمانە بۆ گێڕانەوەی چیرۆکی مۆدێرن ئاشکرا کردووە. بەڵام سرووشتییە کە ئەم زمانە دواتریش لەسەر دەستی چەند نەوە لە شاعیران و نووسەرانی تازەگەری ئێرانی زیاتر پەرەی سەندووە و، تواناکانی بۆ گێڕانەوە، بە تایبەت گێڕانەوەی چیرۆک و ڕۆمانی زهنی زیاتر بووەو، ئیمکاناتی بۆ ئاشکراکردنی قووڵایی زهنییەتی مرۆڤ بەربڵاوتر بووە. عەباس مەعرووفی وەک نووسەرێکی نوێخواز کە داڵغە و کەڵکەڵەی زمانی هەیە، نەک هەر میراتگری زمانی داستانی سادق هیدایەت و، تۆن و ئیقاعی سەمیمانەی بێژەری ڕۆمانی کوندە کوێرەیە، بەڵکو ئاگەداری ئەزموونە ئەدەبی و زمانییەکانی شاعیران و نووسەرانی پاش هیدایەت و، تۆن و ئیقاعی شاعیرانەی چیرۆک نووسانی بەر لە خۆشییەتی. ئەو لە دەوامەی تەقەلای نووسەرانی بەر لە خۆیدا توانیویەتی ئەزموونە زمانییەکەی هیدایەت بۆ نزیک خستنەوەی زمانی گێڕانەوەی داستانی لە ئاخافتنی خەڵک قووڵتر بکاتەوە و، لەحن و ئیقاعی گێڕانەوەکەی لە زهنییەتی کەسایەتییەکان نزیکتر بخاتەوە. کەواتە ئەزموونی زمان و

لەحن و ئیقاعی گێڕانەوەی پەیکەری فەرهاد نەک هەر دووبارەکردنەوەی زمان و ئیقاعی کوندە کوێرە نییە، بەڵکو تازەتر و قووڵتر و بەهۆی نزیکبوونی لە ناخی زهنییەتی بێژەرەکەی سەمیمیتریشە. ئەم زمان و تۆن و ئیقاعە ئیمکاناتێکی زیاتری بۆ وەسف و نواندنەوەی زهنییەتی کەسایەتی چیرۆکەکە هەیە.

یەکێک لە دیارترین تایبەتمەندییەکانی ئەم زمان و تۆن و ئیقاعە داستانییە، لایەنی شاعیرانەیەتی. راستە زمانی کوندە کوێرەش لە زۆر شوێندا زمانێکی شاعیرانەیەو، نەک هەر نووسەران، بەڵکو شاعیرانی تازەگەری پاش هیدایەتیش سوودیان لە زهنییەت و زمانی شاعیرانەی ئەو رۆمانە وەرگرتووە(*)، بەڵام زمانی شیعری پەیکەری فەرهاد بە هەموو رۆمانەکەدا بڵاو بووەتەوە. «لە زەینیدا بەخۆمم گوت ئەمە واتە ژیانی هەتاهەتایی. ئاسوودە بنوو، من سەیرت دەکەم. من خەوتم. لەشم بە پێخەفەکەوە دروو، لە قووڵایی بۆنی پیاوانەیدا نوقم بووم. وەها نوقم بووم کە ئەو ناچار بوو هەموو هەستی بینینی لە پشت قاپووڕی چاوانییەوە بخوازێت و، وەک دەرزی لەشم بە پێخەفەکەوە بدروێت. لە دڵمدا گوتم ئازیزەکەم بە نیگات بمدروو، بەهەر شوێنێکەوە کە حەز دەکەیت بمدروو. بە ژیان، بە مەرگ، بە عەشق و بە هەرچی کە دڵت دەیخوازێت. لە بەرامبەر نیگاتدا دەبم بە هەور، دەبم بە دووکەڵ کە بتوانی وەک با یاریم پێ بکەیت. بە هەناسەی گەرمت فوو لە لەشم بکە، بزانە چۆن ون دەبم.»

---

(*) بۆ نموونە شاملوو رستەگەلێکی شیعری "وەک: بزەیەک لەسەر لێوی لەرزی، وەک سەمای ئاو لە بنمیچەکان، کە رەنگدانەوەی خۆرەتاو بوو." راستەوخۆ لە زمانی کوندە کوێرە وەرگرتووە.

# لە کۆتاییدا

بێگومان وەرگێڕانی ڕۆمانێکی وەک پەیکەری فەرهاد کە تاکبێژییەکی دەروونی و گێڕانەوەیەکی پچڕ پچڕی زهنییە، بۆ هەموو وەرگێڕێک کارێکی گران و ریسکێکی گەورەیە. زمانی ئەم بەرهەمانە «هەروا کە ئاماژەی پێ کرا» کارکردێکی شێعری هەیە و، بە پێچەوانەی زمانی ئینشایی زۆر چیرۆک و ڕۆمانی تر کە تەنیا ئەرکی راگوێزانی مانا و پەیامی لە ئەستۆیە، خۆی داهێنەری مانا و پەیامە. بەشی زۆری ڕووداوەکانی ئەم جۆرە چیرۆک و ڕۆمانە وەک شێعر ڕووداوێکن کە لە زمانی نووسەرەکانیاندا روو دەدەن و، کەم وەرگێڕ دەتوانێت بە تێر و تەواوی لە زمانێکی تردا دووبارەیان بکاتەوە. ئەمە لە لایەک و، لە لایەکی تریشەوە بە داخەوە چیرۆک و ڕۆمانی کوردی تا ئێستاش ئەزموونێکی ئەوتۆی لەم شێوە مامڵەکردنە لەگەڵ زمان و گێڕانەوەی زهنی نییە و، چیرۆکنووسانی کوردیش بێجگە لە چەند کەسێکی دەگمەن بەهایەکی ئەوتۆیان بە جیاوازی نێوان زمانی ڕۆژنامەگەری لەگەڵ زمانی چیرۆک و ڕۆمان و، شێوازی ئاخاوتن و لەحن و ئیقاعی جۆراوجۆری بێژەر و کەسایەتی چیرۆک و ڕۆمانەکانیان نەداوە. ئەڵبەت بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی کوردیش بە شێوەیەک بووە کە پێویستی گێڕانەوە و نواندنەوەی واقیعە عەینی و بەرهەستەکان، دەرفەتێکی بۆ ئاوڕدانەوەی نووسەران لە داڵغە و کێشە و گرفتە زهنییەکانی کەسایەتییە داستانییەکان نەهێشتووەتەوە.

نووسەرانی کورد بە زۆری تا ئێستاش ماناخواز بوون و بە قەدەر پێویست گرینگییان بە زمان و ئیقاع و سەبک و ستایلی جیاوازی

گێڕانەوەکەیان نەداوە. هەروەها زەمینەی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی پێویستیش بۆ ئاوڕدانەوەیان لە کێشە و گرفت و داڵغە زهنییەکان لە ئارادا نەبووە. ئەمانە بەگشتی کاریگەریان کردووە کە زۆرینەی خوێنەری کوردیش ئامادەییەکی ئەوتۆیان بۆ چێژبردن و پێوەندی گرتن لەگەڵ ئەم جۆرە دەقە زهنییانە نەبێت.

من دڵنیام کە توانا ئەمین، وەرگێڕی ئەم رۆمانەش ئاگای لەم راستییانە و، لە ترسناکی و ریسکی کارەکەی بووە، بەڵام وەک وەرگێڕێکی بەجورئەت لەبری ئەوە کە بیر لە ریسکی کارەکەی بکاتەوە، وەک نووسەری رۆمانەکە سەرشێتانە خۆی تەسلیمی سۆزی بێ سنووری راوی یان بێژەری رۆمانەکە کردووە.

ئەگەرچی دەبێ بە راستگۆییەوە دان بەوەدا بنێم کە بە داخەوە من بە هۆی هەندێک گرفتی شەخسییەوە تەنیا توانیومە نزیکەی بیست لاپەڕەی ئەم دەقە لەگەڵ دەقە فارسییەکەیدا بەراورد بکەم، بەڵام بە پێوانەی ئەو بیست لاپەڕەیە پێم وایە کاک توانا بەوپەڕی جیدییەتەوە هەوڵی داوە بەقەدەر توانای خۆی و مەجالی خۆ بەدەستەوەدانی رۆمانەکە بۆ بوون بە کوردی، لە ریسکی کردەکەی کەم بکاتەوە. ئەو ماندوو نەبێت و خوێنەریش سوود لە وەرگێڕانەکەی وەربگرێت.

سوپاسی تایبەتیم بۆ:

* کاک جەبار سابیر کە نوسخەی فارسی ئەم کتێبەی لە تارانەوە بەتایبەت بۆ هێنام.
* کاک عەتا نەهایی و کاک مەسعوود ئەحمەد، کە بە پێداچوونەوە و سەرنجەکانیان، ئەم وەرگێڕانەیان دەوڵەمەند کرد.